لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد

# یادی مەردان

## بەرگی یەکەم

## مەولانا خالیدی نەقشبەندی

مەلا عبدالکریمی مدرس
داینـاوە

چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد - بەغدا
١٩٧٩

بسم الله الرحمن الرحيم

سوپاس و ستایشی بێ‌پایان بۆ ئەو پەروەردگارە پایەدارە کە دڵ لـە ئەندێشەی دەریای بەخششی بێ‌ئەندازە پەرێشانە و ، زمان لە بەیانی بارانی فەیض و ئیحسانیا بێ‌زمانە و ، خامە لە نووسـینی نـامەی میهرەبـانی و تاوانبەخشی و ڕازپۆشیی ئەودا سەرگەردانە • درووودی بێ‌ئەندازەیش بۆ گیانی خاوەن نیشانی سەرداری ڕەهبەران ، ئەو (محمد المصطفی)یە کە چرای ڕێنومای هیدایەت و خوو و ڕەوشتی بەرزی عالەم‌ئارایـە و ئوسـتـادی دەرزی ئەندێشەی پاك و کردەوەی چاك و سەرکەوتنی پلە پلەی بـورجی وەفا و صەفایە • هەروەها بۆ گیانی ئەو ئال و ئەصحابانەی کە هەریـەکێ لەوان هەتا هەتایە وەکو ئەستێرەی جیهان‌تابی ئاسمانی ڕووی دنیـایە •

لەپاش پێشکەش کردنی ئەم سوپاس و ستایش و سەلامە ، عـەرزی خوێندەوارانی ئازیز ئەکەم کەوا گەلێ‌جار بیرم لە ڕۆژانی ڕابوردووی ژیانم ئەکردەوە و ئەو باسە جوانانەم ئەهاتەوە یاد کە لە دۆستانی زانای خۆمـم بیستبوون دەربارەی پیاوە ناودارەکانی وڵاتەکەم ، کە هەریەکێ لەوان وەکو گەردنبەندێکی گەوهەر وا بوون لە ملی گەردوونا ، یا وەك شمشێرێکی دەبان بوون بە دەست پاڵەوانانی مەیدانەوە • تەماشام ئەکرد ها وەختـە ئەو باسە شیرینانە لە یادم دەرچن ، چجای ئەوە کە کەسی‌تریشم نەدەبینـی لێیان ئاگادار بێ • بەم ئەندێشانە دڵم زۆر پەرێشان ئەبوو • لەبەرئەوە لەم دواڕۆژانەی ژیانمدا کەوتمە پەلە بۆ نووسینەوەی ئەوەی لە یادم ماوەتەوە،

لەگەڵ ئەوانەی‌تریش کە لە هەندێ بەڵگە و کتێبدا بەرچاوم کەوتوون [1] • ئەمانەم کرد بە کتێبێکی بە قەدر و نیشان و ناوم‌نا (یـادی مـەردان) و ، سەرەتام لە حەزرەتی مەولانا خالیدی نەقشبەندی‌یەوە دامەزراند و ئـەم بەرگەی کتێبەکەمم بۆ ئەو تەرخان کرد • لە بەرگەکانی پاشەوەشدا لـە ناودارانی لەوەوپاش ئەدووم و ، هیوام‌وایە ئەم کارەم ببێ بە پێڕەو بـۆ لاوانی وڵاتەکەم بۆ بە زیندوو ڕاگرتنی یادی ئەو مەردانەی کە هەڵکەوتووی وڵاتەکەیان و مایەی شانازی بوون بۆ هەموو جۆری ئادەمیزاد •

---

(١) من وەکوو کەسێك کە حەزی لە دەرخستنی ناوی پیاوانی گەورەی ئایین و ئەدەب و زانستی میللەتەکەی بێ و وەکو مەلایەك و یەکێك لە مەنسووبانی تەریقەتی (مجددیه) کە لەناو کۆڕی مەلایان و مەنسووبانی ئەم تەریقەتەدا ژیاوم ، لە زووەوە هەوڵم‌داوە هەندێ ئاثاری مەولانا خالید و خەلیفەکانی کۆبکەمەوە. بەپێی باری وڵات و کات هەوڵم‌داوە و گەلێ بەڵگەی تاکە تاکە و بەکۆمەڵم دەستکەوتووە و گەلی سەرگوزەشتەی گێڕراوەشم لە کەسانی باوەڕ پێ‌کراو بیستووە ، وەك :

ا ) مەکتووباتی فارسیی مەولانا کە لای مەلا زاهیدی پاوەیی بوو کە لە بیارە ئەیخوێند و لای خۆم ئیجازەی مەلایەتیی وەرگرت .

ب ) سەرجەمی مەکتووباتی مەولانا کە لە ماڵی حاجی شێخ مەعصوومی کوڕی حاجی شێخ عارفی کوڕی شێخ حوسەینی هۆرێنی بوو لە قزلڕەبات .

ج ) هەندێ نووسراوی وردە و تاك تاك کە لە سولەیمانی لە خانەقای مەولانا دەستم‌کەوتوون .

د ) هەندێکی‌تر کە لە بیارە لە کتێبخانەی خانەقادا هەبوون .

هـ ) کتێبی (ریاض المشتاقین) کە مەلا حـامیدی کاتبی شـێخ عوثمـان سیراجەددین دایناوە و نوسخەی لای شێخ عەلائەددین هەبوو لە بیارە .

و ) کتێبی ( بغية الواجد في مكتوبات حضرة مولانا خالد ) کە شێخ موحەممەد ئەسعەد صاحێبی برازای مەولانا دایناوە .

ز ) کتێبی ( الفيوضات الخالدية ) کە ئەویش هەر شێخ موحەممەد ئەسعەد صاحێب دایناوە و نوسخەی لە کتێبخانەی بیارەدا هەبوو .

ح ) کتێبی ( الفيض الوارد ) على روضة مرثية مولانا خالد ، تالیف ابی‌الثناء الآلوسي .

**گەلێ پێویستە بۆ ئینسان لە ژینا**
**بە هیممەت بێ لە دنیایا و لە دینا**
**نەهێڵێ ون ببێ ناوی ئەوانەی**
**کە پێشەنگ بوون لە ڕێبازی یەقینا**
**ئەوی ناوی ئەوانی وا لەسەر دەم**
**ئەژی و ئەمرێ لەگەڵ (روح الامین) !**



---

ط ) کتێبی ( التعریف بمساجد السلیمانیة و مدارسها )ی شێخ موحەممەدی قزڵجی .

ی ) لە کتێبی (المجد التالد في مناقب الشیخ خالد )ی ( ابراهیم فصیح الحیدری)یش هەندێ مەعلوماتم دەس کەوتووە .

وەختێ خۆی کە من ئەم مەعلووماتەم کۆکردوەتەوە ، شارەزای ئەو ڕێ و شوێنە تازەیە نەبووم کە ئەبێ ناوی کتێب و لاپەڕەی و ساڵ و شوێنی لەچاپدانی بنووسرێ . بۆیە لەمڕووەوە داوای لێبووردن ئەکەم . بەڵام ئەبێ خوێندەواران دڵنیا بن لەوە کەوا هەرچیم لە کتێبێ وەرگرتبێ بەئەمانەتەوە وەرمگرتووە و ، هەرچیشم بە بیستن بیستبێ لە کەسانیوام بیستووە کە جێگای متمانە و باوەڕ بن .

# مەولانا و بن و بنەچەی

ناوونیشان و ڕشتەی باوك و باپیر و تیرەی ئەم ذاتــە بەمجۆرەیــە :
مەولانا ناوی خالید و کوڕی ئەحمەدی کوڕی حوسەینە و لە تیرەی جــافی مکایەڵی‌یە• دایکی مەولانا ناوی فاطمەیە و لە ساداتی پیر خدری‌یە• مکایەڵی تیرەیەکن لە جافی کۆچەری لە نەتەوەی پیر میکائیلن کە مەشهوورە بــە پیر میکائیلی شەش ئەنگووس (شەش پەنجە) ، کۆزی زستانەیان لە نــاحیەی قەرەداخی سەر بە شارستانی سولەیمانیی ئێستا بووە • بە هاوینانیش چوون بۆ کوێستانە تایبەتی‌یەکانی خۆیان لە کوردستانی ئێران ، بەڵام ئێستـــا خانەنشین بوون و گەرمیان و کوێستان ناکەن •

( پیر میکائیل ) یەکێك بووە لە ئەولیا و صالحانی ڕۆژگار • ئەم ذاتە لە نەوەی خەلیفەی سێهەم حەزرەتی عوثمانی کوڕی عەففانە و لــە ٧٣٨ی هیجریدا کۆچی کردووە بۆ ناوچەی (جوانڕۆ)ی سەر بە شارستانی (سنە) لە کوردستانی ئێران و بۆ ڕێنموونی‌کردنی موسوڵمانان لە دێی (دەودان) کە دێیەکە لەنزیك چەمی سیروان لە ناوچەی جوانڕۆ دانیشتووە و لەوێ کۆچی دواییی کردووە و قەبری لەوێیە • پاش خۆی بە ماوەیەك نەوەکەی هاتوون بۆ ناوچەی قەرەداغ و سەنگاو و لەوێ نیشتەجێ بوون •

## سەردەمی منالّی و تازە پێگەیشتنی مەولانا

مەولانا لە ١١٩٣ی هیجری [1] لە شاری قەرەداغ لەدایکبووە • لە باوەشی باوکی و لە کۆشی دایکیا پەروەردە بووە • لە تەمەنی شەش حەوت سالّیدا ناویانەتە بەر خوێندن و هەر لە قەرەداغ قورئانی خەتم کردووە و کتێبە وردەکانی وەك تەصریفی زەنجانی و عەوامیلی جورجانی و کتێبی تریشی تا ئەگاتە (المحرر)ی فیقهی شافیعی خوێندووە • پاشان کە بەتەواوی پێ گەیشتووە و وای لی هاتووە بتوانێ دوور لە باوك و دایکی بژی ، ناردوویانە بۆ سولەیمانی و بە ئوسووڵی ئەو سەردەمە و تا ئەمدواییەش ، لە یەکێك لە مزگەوتەکانا بووە بە فەقێ و خەریکی خوێندن بووە •

ئەم ذاتە هەر بە منداڵی نیشانەی گەورەیی و بەختەوەری و هوشیاری و هەڵکەوتوویی بە ناوچاوانیەوە دیار بووە • زیرەك و بەئەدەب و دەمپاراو و ڕەفتار و گوفتار جوان بووە و چەشنی شیعر و ئەدەبی بووە • لەناو میرەکانی باباندا کە لەو سەردەمەدا حوکمڕانی ناوچەی سولەیمانی بوون بەحورمەت و قەدرەوە تەماشای کراوە و چ لەبەر بەهرەی خۆی و چ لەبەر ڕێ و شوێنی باوك و باپیر و هۆزەکەی بە خۆشەویستی ژیاوە • پاشانیش نامەی زۆر لەنێوان ئەو و ئەو میرانەدا هاتووە و چووە کە لەجێی خۆیدا ئەو نامانە بڵاو ئەکەینەوە •

## خوێندنی مەولانا

جاران فەقێکانی کوردستان بە ئازادی و بە ئارەزووی خۆیان بۆ هەرکوێ حەزیان بکردایە ئەچوون بۆ خوێندن و لای هەر مەلایەك بە دڵیان

---

(١) لە کتێبەی شێخ ئەسعەد صاحێبدا نووسراوە ڕاستەکەی ئەوەیە مەولانا لە ١١٩٠دا لەدایکبووە .

بوایە ئەیانخوێند • بەمجۆرە بە هەموولایەکی کوردستانا ئەگەڕان و تـا خوێندیان تەواو ئەکرد و ئیجازەیان وەرئەگرت ئەم شارە و شار و ئەم دێ و دێیان ئەکرد • ئیجازە نامەکەیان ڕشتەی ناوی ئەو مامۆستایانەی تیابوو کە زنجیرەی ئیجازەکەیانی ئەچووەوە سەر تا ئەگەیشتەوە سەر حەزرەتی پێغەمبەر دروودی خوای لێ بێ • ئیجازەنامە بە بەڵگەیەکی بایەخدار دائـەنرا بـۆ دەرخستنی پایەی مەلا ئیجازە دراوەکە •

مەولانا خالیدیش ، وەك هەر فەقێیەکی سـەردەمی خـۆی ، بـەم دەستوورە لە سەردەمی فەقێیەتیدا گەلێ مەدرەسەی دیوە و لای گەلـێ لە زانا پایە بڵندەکانی سەردەمی خۆی خوێندوویەتی • ئەو مامۆستایانـەی کە بۆمان دەرکەوتووە مەولانا لای خوێندوون ، وەك لە کتێبی ( المجـد التالد في مناقب الشيخ خالد )ی (ابراهيم فصيح الحيـدری) و (التعريـف بمساجد السليمانية ومدارسها )ی شێخ موحەممەدی قزڵجی و ( الشيـخ معروف النودهی )ی شێخ موحەممەدی خاڵدا نووسراوە ، ئەمانەن :

سەیید عەبدولکەریمی بەرزنجی مامۆستای مزگەوتی عەبدولڕەحمان پاشا لە گەڕەکی (سەرچیمەن) لە سولەیمانی • سەیید عەبدولڕەحیمی برای سەیید عەبدولکەریم • شێخ عەبدوڵڵای خەرپانی • مەلا ئیبراهیمی بیارەیی • مەلا جەلالەددینی خورماڵی • مەلا مەحموودی غەزایی • مـەلا صـاڵحی تەڕەماری[1] • مەلا عەبدولڕەحیمی زیاری [2] • مەلا موحەممەدی باڵەکی کە مەشهوورە بە ئیبنوئادەم • شێخ موحەممەد قەسیمی سنەیی کە ئیجازەشی لە خزمەتدا وەرگرتووە •

---

(١) تەڕەمار : دێیەکە لە ناوچەی (سورداش) لە شارستانی سولەیمانی .

(٢) زیارەت : دێیەکە لە نزیك (شەقڵاوە) ، مەلاکانی بە (مـەلازادە) ناویان دەرکردووە .

ئــەوەی کە زانراوە ئەوەیــە مەولانــا (شرح شمسی) و (مطوّل) و ( حکمة ) و (کلام)ی لە سولەیمانی و دەوروبەری سولەیمانی خوێنــدووە • حاشیەی (جلال‌الدینی دوّانی) لەســەر (تهذیــب المنطــق)یشی لای مەلا عەبدولڕەحیمی زیــارەتی خوێنــدووە • عیلمی حیســاب و هەندەســە و ئوستورلاب و فەلەکیاتیشی لای شێخ قەسیم خوێندووە [٣] • شــەرحی ( مختصر المنتهی )ی (اصول الفقه)یشی لە بەغدا خوێندووە [٤] •

بە هەرجۆر مەولانا لە هەموو عیلمە عــەقڵی و نەقڵی‌یــەکانی ئــەو سەردەمەی خوێندنگا ئیسلامی‌یەکاندا ، وەك صەرف و نەحو و مەعانی و بەیان و بەدیع و وەضع و مەنطیق و ئادابی بەحث و موناظەرە و حیکمەت و هەیئەت و حیساب و هەندەسە و عەرووض و قافیە و ئــەدەب و لوغەت و شەرع و ئوصوولی فیقهـ و ئوصوولی دین و حەدیث و تەفسیر و تەصەووف، زۆر بەرز و هەڵکەوتوو خاوەن‌پایە بووە ، بەچەشنێ کە هەر ئیشــکال و ئاڵۆزی‌یەك پەیدابووبێ لە ناوچەکەدا لای ئەو چــارەی دۆزراوەتــەوە و زانایانی سەردەم دانیان بە بەرزیی پایەیدا ناوە •

ئیبراهیم فەصیحی حەیدەری نووســیویە هەر شوێنێــکی گران و موشکیل لە تەفسیری بەیضاوی یا توحفەی ئیبنو حەجەر یا شەرح مەواقیف یا شەرح تەجرید یا شەرح مەقاصید یا شەرح مەطالیع و حاشیەکانی سەیید شەریف لەســەر شــەرح مەطالیع یا حاشــیەکانی عەبدولحەکیم لەســەر شــەرح شــەمسی یا شــەرح مــەواقیف یــا حاشــیەکانی شــەرحی موختەصەری مونتەها یا موحاکەماتی ئەحمەدی کوڕی حەیدەر لەســــەر شــەرحی جەلالی دەووانی لەســەر عەقایدی عەضودی‌یە یا شــورووحی ئیشارات یا شورووحی تەذکیرە لە عیلمی هەیئەتدا یا لە غەیری ئەم کتێبانەدا

---

(٣) الفیض الوارد علی روضة مرثیة مولانا خالد ، تالیــف ابی الثناء محمود الآلوسي .

(٤) المجد التالد في مناقب الشیخ خالد ، تالیف ابراهیم فصیح الحیدري .

بوایه و پرسیار له مەولانا بکرایه لەبارەیەوە ، بەئاسانی ڕوونی ئەکردنەوە و ئیشکالی پرسیارکەرەکانی نەئەهێشت بەجـۆری که زانایـانی سـەردەم لەو جۆره تەقریر و ڕوونکردنەوەیه سەرسام ئەبوون . بەهۆی ئەم زانسته زۆرەیەوە له هەموولایەکی کوردسـتانا لەناو ئەهلی عیلـم و مەعریفەتدا شۆرەت و ناوبانگی پەیدا کردبوو . که ئیجازەی مەلایەتیی له مـامۆستای گـەورەی خۆی شێخ قەسیمی مەردۆخەییی سـنەیی وەرگرت و هاتەوە بۆ خاکی بابان و گەیشتەوە شاری سولەیمانی ، لەناو مەلایانی ولاتـەکەدا پەنجەیان بۆ ڕائەکێشا . عەبدولڕەحمان پاشای بابان داوای لێکرد بـە وەزیفەی دەرزوتنەوە له مزگەوتێ له مزگەوتەکانی سولەیمانی دامەزرێ ، بەلام ئەو قوبوولی نەکرد و بیانووی بەوە هێنایەوە کەوا شایستەی پایـەی دەرزوتنـەوەی فەقـێیان نییە[٥] ، تا سـەیید عەبدولکەریمی بـەرزنجی مامۆستای خۆی له سالی ١٢١٣دا به دەردی تاعوون کۆچی دوایی[٦] ئـەکـا ئەوسا مەولانا به فەرمانی پاشا له شوێنی مامۆستایـدا به وەزیفـەی دەرز وتنەوە دائەمەزرێ و له هەموولایەکەوە فەقێی له دەور کۆئەبنەوە و دەست ئەکا به دەرزوتنەوە پێیان ، بەجۆرێ که له هەموولایەکی ولاتدا ناوبانگ دەرئەکا ، بەتایبەتی له زانستی حیـکمەت و کەلامدا . کاتێـکیش که کاری دەرزوتنەوەی نابێ ، خەریکی کتێب دانان ئەبێ و گەلێ حاشیەی بەقیمـەت

---

(٥) وادیاره مەولانا زۆر مەلا چاك بووه و عیززەتی نەفسیشی زۆر بووه ، بۆیه له شوێنی بێناوا دەرزی نەوتوەتەوە و تا ماوەیەکیش شـوێنی گەوره و ناوداری دەست نەکەوتووه . له سـەیید ئەحمـەدی کوڕی شێخ عەبدولڕەحمانی عازەبانیم بیست وتی : مەولانا بەرلەوەی بڕواته مزگەوتی عەبدولڕەحمان پاشا که ئێستا به مزگەوتی شێخ بابەعەلـی بەناوبانـگه ، له مزگەوتی ناوبازاڕا دەرزی وتوەتەوە که عەزیز ئاغای مەسرەف له سەردەمی ئەحمەد پاشادا تەعمیری کردوەتەوە .

(٦) مەولانا به پارچه شیعرێکی فارسی ئەم مامۆستایەی خۆی لاواندووەتەوە و ڕستەی ( کفاکم خالدا داری النعیم )ی بۆ کردووه به مێژووی کۆچکردنی.

لەسەر گەلێ کتێبی بایەخدار ئەنووسێ وەك لەمەولا لە باسی تەئلیفاتەکانیدا باسی ئەکەین •

مەولانا لەوماوەیەدا کە خەریکی دەرزوتنەوە بووە ، گەلێ بە عیززەتی نەفس و ئیستیغنا لە خەڵکەوە ژیاوە و گەلێ لە دنیا و ئەهلی دنیا دووربووە و بە شێوەی ئینسانێکی قانیع و واریع ژیانی خۆی ڕابواردووە• هەمیشە وەکو کەسێك کە شتێکی زۆر بەنرخی ونکردبێ و بگەڕێ بیدۆزێتەوە ، موشتاق بووە بەختی یار بێ بگات بە مورشیدێکی ڕۆحیی خاوەن تەصەڕوف و هێز عیلمی تەصەوفی لێ وەربگرێ و لە چاڵی مادده و دنیا خواهی‌یەوە بگات بە پایەی بەرزی مەعنەوی و بە کەمالاتی ئینسانی و لە پێوەندی‌یە نەفسانی‌یەکان ئازاد ببێ •

## کورتەیەك لەبارەی مامۆستاکانی مەولانا و ڕشتەی سەنەدی ئیجازەیانەوە

یەکەم : سەیید عەبدولکەریمی بەرزنجی کە زانایەکی بەرزی وڵاتی سولەیمانی بووە و مامۆستای چەند عالمی گەورە بووە وەکو مەلا ئیبراهیمی بیارەیی کە هەڵکەوتووی سەردەمی خۆی بووە • ئەم ذاتە خۆی و سەیید عەبدولڕەحیمی برای سەنەدی ئیجازەنامەیان ئەچێتەوە سەر سەیید موحەممەدی کوڕی خضری حەیدەری •

دووهەم : شێخ عەبدوڵڵای خەرپانی کوڕی سەیید ئیسماعیلی کوڕی سەیید موحەممەدی مەشهوور بە شێخ موحەممەدە کۆسە لە سەییدەکانی تەکیەی قەرەداغ کە لە نەوەی ئیمام حەمزەی کوڕی ئیمام مووسای کاظم بووە • ئەم شێخ عەبدوڵڵایە سەنەدی ئیجازەی ئەچێتەوە سەر سەیید موحەممەدی کوڕی خضری حەیدەری • ئەم ذاتە لە عولوومی دینیدا لە

سەرامەدانی ڕۆژگار بووە و عومرێکی زۆری بە دەرزوتنەوەوە بردووەتە سەر • مەشهوورە یەکێ لە فەقێکانی مەدرەسەی ئەو پاش خوێندنی کتێبی موطەووەلی مەلا سەعدی تەفتازانی و ئیجازە وەرگرتن ڕۆیشتووە و لەسەر دەرزوتنەوە دامەزراوە و ژنی هێناوە • کوڕی ئەم فەقێیەیش هەروا لە خزمەتی شێخ عەبدوڵڵادا موطەووەلی خوێندووە و ئیجازەی وەرگرتووە و چووە بووە بە مودەڕڕیس و ژنی هێناوە و کوڕی ئەویش پێگەیشتووە و هاتووەتە خزمەتی شێخ عەبدوڵڵا موطەووەلی خوێندووە و ئیجازەی وەرگرتووە •

شێخ عەبدوڵڵای خەرپانی لای میرەکانی بابان زۆر بە قەدر و حورمەت بووە و بەروبوومی دێی خەرپانی و گەلێ لە باخەکانی چەمی تەوێڵەی بۆ دیاری کراوە بۆ مەسرەفی خۆی و فەقێکانی مەدرەسەکەی و زۆر بە خۆشی و فەرەحی ڕایبواردووە • مەشهوورە یەکێ لە سانەکانی ( لهۆن ) لەو سەردەمەدا ویستوویەتی بە گەڕ و بیانووی ئیجارە یا چاودێری کردنەوە خەرپانی و باخەکانی چەمی تەوێڵە لە دەستی شێخ عەبدوڵڵا دەربکا • بەمبۆنەیەوە مەلا جەلالی خورماڵی کە برادەری شێخ عەبدوڵڵای خەرپانی بووە و یەکێ بووە لە زانا گەورەکان ئەم بەیتە فارسییەی بۆ نووسیوە :

از بهر تست مخصوص خرپانی و طویله
آگاه باش نستانندت بـه مکر و حیله

شێخ عەبدوڵڵا بە زستان لە مزگەوتی ناودێی خەرپانی و بە هاوین لەسەر ئاو و باخی ( هۆبە ) لە سەرووی دێی خەرپانییەوە دەرزی وتووەتەوە • ئاو دێی خەرپانی هاوینان گەرمە ، بۆیە فەقێکان لە گەرمای ناودێ وەڕز بوون • یەکێ لە فەقێکان قەسیدەیەکی لە زەمی خەرپانیدا وتووە ئەمە بەیتێکیەتی :

**گر جهنم بود چو خرپـانی**
**و قنـا ربنـا عذاب النار**

شێخ عەبدوڵڵا لەشی ساغ بووە و هێزی لەش و چاوی زۆر باش بووە • ئەگێڕنەوە چەند جار هەندێ لە فەقێکانی چوون کتێبی دەرزیـان لەبـەر حوجرەی بالاخانەکەیدا کردووەتەوە و بـۆیان ڕاگرتووە ، ئەویش لەسەرەوە لە پەنجەرەی حوجرەکەیەوە کتێبەکەی خوێندووەتەوە •

سێهەم : مەلا جەلالی خورماڵی• ئەمیش یەکێ بووە لە زانا گەورەکانی هاوچەرخی شێخ عەبدوڵڵا و نێوانیان زۆر خۆش بووە و گەلێ نامەی پڕ لە نوکتەیان لەنێواندا هاتووە و چووە • مەلا جەلال لەناو بابانەکاندا زۆر بەقەدر و حورمەت تەماشای کراوە و گەلێ باخات و زەوی‌وزاری لـــە خورماڵ و دێی زەڵم و چەمی بیـارە دراوەتێ بۆ ناندانی فەقێـکانی و تائێستاش باخێك لە چەمی بیارە هەیە پێی‌ئەڵێن ( کۆگای مزگەوت ) وەقفی مزگەوتی خورماڵ بووە • مەلا جەلال گەلێ جار هاوینان لە چەمی بیـارە ڕاییواردووە و فەقێکانی لەگەڵ خۆی بردووەتە ئەوێ •

هەرچەند لە کتێبەکەی ئیبراهیم فەصیح و شێخ موحەممەدی خاڵدا باسی ئەوە نی‌یە کە مەولانا لای مەلا جەلالی خورماڵی خوێندبێتی ، بەڵام لە بناری هەورامان لەناو مەلاکاندا باوە کە مەولانا لە خزمەتی مەلا جەلالدا خوێندوویەتی • تەنانەت کاتێ کە مەولانا لە خورماڵ بووە ، مـەلا جەلال نەخۆش بووە و چەند ڕۆژێ نەهاتووەتە دەرەوە بـۆ مەدرەسە • مەولانا چەند شیعرێکی بۆ نووسیوە و تکای لێ کردووە تەشریف بێنێ بۆلایان • ئەمە چەند بەیتێکە لەو شیعرانە کە بە نازناوی ( نووری ) نووسـیونی چونـکە لەو سەردەمەدا نازناوی شیعریی ( نووری ) بووە :

**میرزام وەفاتەن .. میرزام وەفاتەن**
**قەدەم ڕەنجە کەر ، وادەی وەفاتەن(١)**
**شەهەنشای شـادیم مات ناماتەن**
**بتپەرسا ئاسا ئەرۆام جە لاتەن (٢)**
**جە حوجرەی سەراو کەی مبی ڕاهی**
**هێند مەمدرۆ ماه جە بورج ماهی(٣)**
**قەدەم ڕەنجە کەر ئامان صەد ئامان**
**تۆز ئامانت شیفان پەی زامان(٤)**
**وەرنە ها تەمام نائیرەی دووری**
**وە کۆی نوورە کەرد سەرتاپای ( نووری )(٥)**

بەڵام من خۆم لە مەکتووباتی مەولاناوە بۆم دەرکەوتووە کەوا مەولانا لە خزمەتی مەلا موحەممەدی کوڕی مەلا جەلالدا خوێندوویەتی • لەمەوە و لەوەوە کە مەولانـا لـە سـەردەمی مەلا جەلالـدا لـە خورمـاڵ بووە ، دەرئەکەوێ ئەگەر هەر بۆ تەبەڕڕوکیش بووبێ ئەبێ هیچ نـەبێ چەنـد دەرزێکی لای خۆیشی خوێندبێ •

---

(١) واتە : گەورەم ! وادەی وەفاکردنتە بە گفتەکەی خۆت کە بێیت بـۆ لامان • یاخود وادەی مردنمانە لەبەر دووریی تۆ ، دەسـا فەرمـوو ئازاری پێی خۆت بدە و وەفا بە گفتەکەی خۆت بـکە و بێ بۆ لامان .

(٢) واتە : شاهەنشای شادمانیی من ماتی نەهاتنی تۆیـە ، منیـش وەك بتپەرسـت گیانم لای تۆیە و یادت ئەکەمەوە .

(٣) واتە : کەی لە ژوورەکەی خۆتەوە کە کەوتووەتە سـەر سەرچـاوەی ئاوەکە ، ئەکەویتە ڕێ و دێیی بۆ لامان ؟ من سـەرم سـوڕ ماوە تـۆ ئەوەندە لە جێیی خۆتدا نەجووڵێیی .. هەرگیز مانگ ئەوەندە لە برجی ماسیدا خۆی ڕاناگرێ. (سەرنجی پێوەندی [سەراو] و [ماسـی] بدە ) .

(٤) واتە : ئازاری پێیی خۆت بدە و بێ بۆ لامان ، چونکە تۆزی بەری پێت کە دێیی بۆ لامان ئەبێ بە مایەی چاكبوونەوەی زامەکانی دڵمان .

(٥) واتە : ئەگینا ئەگەر نەیەیـت ، هـا ئەوەنـدەت زانی ئـاگری دووری سەرتاپای (نووری)ی سووتاند و کردی بە کۆی نوورە ..

ئێستاش لە مزگـەوتی خورماڵدا حوجرەیەك هەیە مەشـهوورە بە حوجرەی مەولانا و ئەڵێن مەولانا لەو حوجرەیەدا ژیـاوە • بـەڵام من لاموایە ئەم حوجرەیە هیی ئەو سەردەمەیەتی کە بۆ ئیرشاد چـووە بـۆ هەورامان و لە خورماڵ دانیشتووە ، نەك هیی سەردەمی فەقێیەتی ، چونکە کەم وائەبێ فەقێیەك حوجرەی تـایبەتیی خۆی هەبێ بۆ خوێندن و بـە جیا لە فەقێکانی‌تر بژی •

ئەم مەلا جەلالە چەند کوڕێکی بووە ، لەناو ئەم کوڕانەیـدا نـاوی مەلا موحەممەد و مەلا مصطەفا و مەلا موحەممەد ئەمینیان دیارە • پاشان کە مەولانا دەستی کردووە بە ئیرشاد ، ئەم مەلا مصطەفایە و کوڕەکانی‌تری مەلا جەلال و هەروەها مەلامصطەفای برای مەلا جەلالیش لەسەر دەستی مەولانادا تەریقەتیان وەرگرتووە •

وەك لە مەکتووباتی مەولانا خۆیەوە دەرئەکەوێ مەلا جـەلال لـە ١٢٣١ی هیجریدا کۆچی دوایی کردووە • لە خوالێخۆش بوو شـێخ عەلائەددینی عوثمانیم بیستووە ئەیفەرموو مەلا جەلال لـە چەمی بیـارە بووە نەخۆش‌کەوتووە و کۆچی دوایی کردووە و جەنازەکەیان بردووەتەوە بۆ خورماڵ و لە گۆڕستانی خورماڵدا ناشتوویانە •

چوارەم : شـێخ موحەممەد قەسـیمی کوڕی شـێخ ئەحمـەدی مەردۆخەیی ، مامۆستای مزگەوتی دارولئیحسانی سنە کە زانایەکی گەورەی کوردستانی سەردەمی خۆی بووە • ئەم ذاتە برای شـێخ موحەممـەد سەعیدی باوکی شێخ قادرە کە شەرحی لەسەر کتێبی (تهذیـب الکلام) نووسیوە • کاتێ کە مەولانا لە هیندستان ئیجازەی ئیرشادی ئەدرێتێ و ئەگەڕێتەوە بۆ کوردستان و ئەگاتە شاری سنە ، شێخ موحەممەد قەسیمی مامۆستای تەمەسسوکی پێ‌ئەکا و ئەبێ بە خەلیفەی و ئاخری عومری لـە

تەصەووف و ئیرشاددا صەرف ئەکا تا لە ١٢٣٦ی هیجرەتدا کۆچی دوایی ئەکا •

پێنجەم : مەلا ئیبراهیمی بیاردیی کە ئەویش ئیجازە دراوی سەیید عەبدولکەریمی بەرزنجی بووە و عالمێکی گەورەی سەردەمی خۆی بووە و لە دەوروبەری ١٢٥٠ی هیجرەتدا لە بیارە کۆچی دوایی کردووە •

شەشەم : مەلا موحەممەدی باڵەکی کە مەشهوورە بە ئیبنو ئادەم • ئەم ذاتە عالمێکی زۆر گەورە و هەڵکەوتوو و موئەللیفێکی خاوەن قەڵەم بووە • وا مەشهوورە لە هەموو عیلمێکی عەقڵی و نەقڵیدا تەئلیفی هەیە • بەداخەوە ئەو کتێبانەی لەچاپ‌نەدراون و نازانم ئاخۆ چەندیان لای نەوەکانی و لای مەلایانی ناوچەی باڵەکایەتی ماون و چەندیان فەوتاون• ئەم ذاتە ئیجازەی لە خزمەتی مەلا عەبدوڵلای بایەزیدیدا وەرگرتووە ، ئەویش لە خزمەتی صیبغەتوڵلا ئەفەندیی حەیدەریدا ئیجازەی وەرگرتووە و وەك خواڵیخۆش‌بوو شێخ موحەممەدی قزڵجی نووسیویە لە دەوروبەری ١٢٣٠ی هیجرەتدا کۆچی دوایی کردووە •

ئەم مەلا موحەممەدی ئیبنو ئادەمە مامۆستای مەلا موحەممەدی خەتێ بووە • ئەمیش مامۆستای حاجی مەلا ئەحمەدی نۆتشەیی و مەلا عومەری خەیلانی بووە کە لە ڕەواندز مەدرەسەی بووە • مەلا عومەریش مامۆستای حاجی عومەر ئەفەندیی باوکی مەلا ئەفەندیی هەولێر بووە • ئەمانە هەموو لە کەڵە مەلاکانی کوردستان بوون لە سەردەمی خۆیاندا ڕەحمەتی خوایان لێ بێ •

حەوتەم : مەلا صاڵحی تەڕەماری کە ئیجازەی مەلایەتیی لە صاڵح ئەفەندیی حەیدەری وەرگرتووە کە ئەویش ئیجازەی لە ئیسماعیل ئەفەندی حەیدەری و ئەویش لە صیبغەتوڵلا ئەفەندیی حەیدەری وەرگرتووە•

هەشتەم : مەلا عەبدولڕەحیمی زیارەتی کە ئەویش ئیجازەی هەر لە صیبغەتوڵلاّ ئەفەندی وەرگرتووە •

سەنەدی ئیجازە نامەی عالمانی بنەماڵەی حەیدەری ئەچێتەوە سەر باپیرە گەورەی خۆیان ، زانای بەناوبانگ حەیدەری یەکەم • ئەم ذاتە گەلێ تەئلیفاتی بەنرخی هەیە وەکو حاشیەی لەسەر (اثبات الواجب)ی جەلالەددینی دەووانی و لەسەر شەرح عەقایدی جەلال لەسەر عەقایدی عەضودییە و گەلێ تەئلیفی نایابی تر •

ئەم ذاتە لە نەوەی شێخ صەفیەوددینی ئەردەبیلی‌یە کە باپیرەی پادشاهانی صەفەویی ئێرانە • پاش ئەوەی کە صەفەوی‌یەکان بە ڕەسمی ئیعلانی مەذهەبی شیعەیان کرد ، بنەماڵەکەیان کۆچیان کرد بۆ کوردستانی عوسمانی • حەیدەری یەکەم کە هاتە کوردستانی عوسمانی ئیجازەی مەلایەتیی لای شێخ عومەری باڵەکی وەرگرت کە قەبری لە دێی (زینوێ شێخ)ە •

بنەماڵەی حەیدەری کە هاتنە کوردستانی عوسمانی لە بەشی باکووری شارستانی هەولێری ئێستا نیشتەجێ بوون و دەستیان‌کرد بە بڵاوکردنەوەی زانست و خزمەتی موسوڵمانان و ڕێگا پیشان‌دانیان • حەیدەری یەکەم لە ١٠٧٠ی هیجرەتدا لە هەولێر کۆچی دوایی کردووە • ئەم بنەماڵەیە نزیکەی ٣٠٠ ساڵ لە کوردستانا خزمەتی عیلم و دینیان کردووە • دەیان زانای گەورە و هەڵکەوتوویان تیا پەیدابووە و فەقێ لە هەموولایەکی کوردستان و وڵاتانی دەوروپشتەوە لە تورك و عەرەب هاتوونە لایان خوێندوویانە و ئیجازەی مەلایەتی‌یان لا وەرگرتوون • ئەم بنەماڵەیە دەیان تەئلیفی بایەخداریان نووسیوە • مێژووی ئەم بنەماڵەیە و خزمەتی بە زانست و ئایین لە کوردستانا پێویستی بە تەئلیفێکی تایبەتی هەیە •

بچینەوە سەر باسی ئیبنو ئادەمی مامۆستای مەولانا •

شێخ موحەممەدی خاڵ لە کتێبەکەیدا کە لەبارەی شێخ مارفی نۆدێوە نووسیویە ئەڵێ : ئەم ذاتە موحەممەدی کوڕی ئادەمی کوڕی عەبدوڵلایە لە دەوروبەری ١٧٤٧ی میلادیدا لە دێی ( ژۆستێ ) لە ناحیەی ( باڵەك ) لەدایكبووە و لە خزمەتی باوکیدا خوێندوویەتی کە ئەویش زانایەکی پایە بەرز بووە و وردە حاشیەی لەسەر هەندێ کتێب نووسیوە • ئەنجا چووەتە خزمەتی مەلا عەبدوڵڵای بایەزید بۆ خوێندن و لای ئەو ئیجازەی وەرگرتووە و وەك پێشتر باسمان‌کرد ئەم مەلا عەبدوڵلایەش فەقێی صیبغەتوڵلا ئەفەندی بووە •

ئیبنو ئادەم سەفەری ئەملا و ئەولای زۆر بووە• لە ١١٩٢ی هیجرەتدا چووە بۆ سابلاخ بۆ فێربوونی فارسی • ئەمەش پاش چەند ساڵ مەلایەتی بووە • کە گەڕاوەتەوە چووەتە ڕەواندز و لە سەردەمی موحەممەد پاشادا لەوێ بووە بە مەلا و دەستی بە دەرزوتنەوە و کتێب دانان کردووە • موحەممەد پاشایش زۆر بەحورمەت لەگەڵی جووڵاوەتەوە • پاشان لەبەرئەوە کە ناکۆکی کەوتووەتە نێوان ئەو و موحەممەد پاشاوە ، ڕەواندزی بەجێ‌هێشتووە و چووەتە دێی (دێلزە) و لەوێ ماوەتەوە تا لە ١٢٥٢ی هیجرەتدا کۆچی دوایی کردووە و لە (کەونە خانووان) نێژراوە • ئیبنو ئادەم لە ڕەواندز فەقێی زۆر چاکی هەبوە و لە هەموو لایەکی کوردستانەوە ڕوویان تێ‌کردووە کە مەولانا و مەلای خەتێ و مەلا عەلیی وەسانی لەمانە بوون •

ئیبنو ئادەم یەکێك بووە لە مەلا هەرە بەناوبانگەکانی سەردەمی خۆی • ئیبراهیم فەصیح حەیدەری لە کتێبی (عنوان المجد)دا نووسیویە ئەڵێ : یەکێك لە گەورەترینی ئەو عالمانە کە لە سەردەمی منالیی خۆمدا بە خزمەتیان گەیشتووم لای باپیرم ، هەرە زانای زەمان (علی الاطلاق) ، پایەبەرز بەسەر هەموو زانایانی عێراقدا ، خاوەنی تەئلیفاتی هەڵژمێرراو و

تەقریراتی سوودبەخش ، مامۆستای هەموان لە هەموو شتێکدا ، مەولانا موحەممەدی کوڕی ئادەمی کوردە ، گۆڕی پڕ بێ لە نوور ، کە مەولانا خالید لە خزمەتیا خوێندوویە و زۆر لە زانایانی عێراق لای خوێندوویانە و باپیری زانام سەیید ئەسعەد صەدرەددینی حەیدەری و مەولانا مەلا یەحیای مزووری و مەولانا شێخ عەبدولڕەحمانی ڕۆژبەیانی کە لە مەلا گەورەکانی عێراقن ، دانیان بە عیلم و فەضڵیدا ئەنا و لە پایەی فەخرەددینی ڕازیدا بوو و زیاتر لە صەد کتێبی لە عولوومی عەقلی و نەقلیدا نووسیبوو و شەرحی لەسەر (اثبات الواجب)ی جەلالی دەووانی کردبوو کە لە وردترین کتێبەکانی عیلمی کەلامە و ، تەنها پشت بە زانستی خۆی شەرحی کردبوو بێ ئەوەی تەماشای هیچ کتێبێکیتری عیلمی کەلامی بۆ بکا •

ئەم ذاتە بەشی زۆری کتێبەکانی لە دێی (ڕۆستێ) تەئلیف کردووە • ئەمەش لیستەی ناوی ئەو کتێبانە :

١ ــ مشكاة المنقول في اربعة فنون : النحو والصرف والعروض والمنطق • لە ساڵی ١٢٠٥دا دایناوە ، نوسخەی بە خەتی خۆی ماوە •
٢ ــ مصباح الخافية في شرح نظم الكافية في النحو •
٣ ــ تعليقات على شرح السيوطي على الفية ابن‌مالك في النحو •
٤ ــ تعليقات على حواشي الفوائد الضيائية لعصام‌الدين الاسفرايني•
٥ ــ تعليقات على حواشي الفوائد الضيائية لعبدالغفور اللاري •
٦ ــ تعليقات على الچارپردی على شرح الشافية في الصرف •
٧ ــ كتاب في الوضع والبيان والآداب •
٨ ــ تحرير البلاغة •
٩ ــ شرح تحرير البلاغة •

١٠ـ تعليقات على المطول للتفتازانى و على حواشيه للسيد الجرجانى وحسن چلبي وعبدالحكيم .

١١ـ حاشية على شرح مقدمة التلخيص .

١٢ـ مرآة المأمول في المنطق .

١٣ـ ميقات المعقول في شرح مرآة المأمول في المنطق .

**١٤ ـ مرآة المعقول المشتمل على الميزان في المنطق والهندسة والحساب** والهيئة والحكمة الطبيعيه والالهيات والكلام ، ثم شرح الميزان والهندسة والهيئة والحساب .

١٥ـ شرح رسالة الحساب لبهاءالدين العاملي .

١٦ـ شرح اشكال التاسيس في الهندسة .

١٧ـ مفتاح المغيب في العمل بالربع المجيب .

١٨ـ تذكرة الاحباب في العمل بالاسطرلاب .

١٩ـ تعليقات على الچغمينى للقاضى زاده الرومى في الفلك .

٢٠ـ شرح على زيج الغ بيگ .

٢١ـ روزنامه ( التقويم ) .

٢٢ـ مفتاح التنجيم في شرح التقويم .

٢٣ـ تشريح السيارات في الفلك .

٢٤ـ تعليقات على شرح الروزنامة الجديدة والقديمة .

٢٥ـ شرح فرائض المنهج في الفقه .

٢٦ـ مجالس النواميس في الوعظ .

٢٧ـ سلسلة الذهب .

ئـەم کتێبـەی دوایی مێژووی ژیانی خۆیـەتی لە سـالی ١٢٣٤ی هیجرەتدا دایناوە ، باسی خۆی و ئەو دەرد و مەینەتەی تیایە کـە بەهۆی کێشەی نێوان خۆی و میری گەورەی ڕەواندزەوە چەشتوویەتی . ئەم کتێبە

کتێبێکی بایەخدارە ، دانەیەکی لە کتێبخـانەی جارانی عەبباس عەززاویدا هەیە کە ئێستا کەوتووەتە دەست کتێبخانەی ئاسار • کتێبەکانیتریشـی هەندێکیان لای نەوەکانی ماون لە ناوچەی ڕەواندز •

ئیبنو ئادەم دوازدە کوڕی بووە ، هەندێکیشیان لە زانستدا سەرامەد بوون و کتێبیشیان داناوە • ئێستاش نەوەی لە دێی ڕۆستێ هەن •

ئیبنو ئادەم ئارەزووی شیعر وتنیشـی بووە و نازنـاوی شـیعریی ( واجم )ە •

لە مەلا عوسمانی شەقلاوەم بیستووە کە وەختێ خۆی لای مـەلا عەبدوڵڵای کوڕەزای ئیبنو ئادەم خوێندوویەتی ئەیـوت لەناو بنەماڵەی ئیبنو ئادەمدا مەشهـوورە کاتێ کە مەولانـا فەقێ بووە و لای ئیبنو ئادەم خوێندوویە ، ئیبنـو ئادەم هەمووجارێ پێیوتووە : خالید تۆ فەقێیـەکی تێگەیشتوویت و ئەبێ بە مەلایەکی چاك ، هەرچەند لە سیمات وادەرئەکەوێ ئارەزووی تەریقەت و شێخیەتیشـت هەبێ و لاموایـە ئەبێ بـە شێخی ئیرشـاد • بەڵام من ئێسـتا پێت‌ئەڵێم نـەوەك لەوکـاتەدا تـەرجیحی شێخایەتییەکەت بدەی بەسـەر مەلایەتی و دەرز وتنەوەکەتدا ، چونـکە لە دنیادا لە فەضیلەتی زانست بەرزتر نییە •

بگەڕێینەوە سەر باسی مەولانا :

هۆزی مکایلی هاوینان ڕۆیشتوون بۆ کوێستانی هەورامانی بەشـی ئێران و لە ( قەڵاخـانی ) و دەوروبـەری ( کانیی حـەوش و بارانی ) هاوێنـەکەیان بەسەربردووە • مەولانا کە بە منالی ئولفەتی لەگەڵ ئـەو ناوچەیە گرتووە ، لە سەردەمی فەقێیەتیشـدا چووە بۆ ئەو ناوە و لەوێ خوێندوویەتی ، بەڵام نازانین لای چمەلایەك لەوناوە خوێندوویەتی •

هەروا پاش ئەوەش کە دەستی کردووە بە ئیرشاد چووەتەوە بۆ هەورامان و لە حەوش و بارانی ژیاوە • بە زوبانی مەولاناوە ئەگێڕنەوە کە فەرموویەتی : « لە هەواری کەراویە دۆڵەوە تا بەندەنی قەڵاخانی بەهەشتی سەرزەوەیە » •

دایکی مەولانایش لە یەکێ لەو هاوێنە گەشتانەی هۆزی مکایەڵیدا مردووە و قەبری لە قەبرستانی ( داری بەرمەڕان )ە لە نزیکی بیارەوە •

## باسی سەفەری مەولانا بۆ حەج و زیارەتی ئارامگای پێغەمبەر دروودی خوای لێ بێ

وەکو لە کەسانی خاوەن مەعریفەت و شارەزا و خەبەردارەوە بە ئێمە گەیشتووە مەولانا هەر لەوکاتەوە کە فامی پەیداکردووە و ئاوزاویەتی ، نیشانەی بلیمەتی و هەڵکەوتوویی و دووری لە دنیا پەرستی و حەز لە هیممەتی بەرز و پایەی بڵندی پێوە دیار بووە • بە دڵ پێوەندی لەگەڵ پیاوانی خوا بووە و ئارەزووی لێ بووە تووشیان بێ و لەگەڵیاندا هەڵسێ و دانیشێ و لە بەرەکەتیان بەهرەمەند بێ • بەتایبەتی پاش تەواوکردنی خوێندن و دەستکردنی بە دەرزوتنەوە ئەم سۆزە زیاتر لە دڵیدا پەرەی سەندووە •

لەسەر ئەم بناغەیە ئارەزووی بەجێهێنانی فەرزی حەج و زیارەتی ئارامگای پێغەمبەر (د) لە دڵیدا جێگیر ئەبێ و بڕیاری سەفەر ئەدا • لە ساڵی ١٢٢٠دا ئەکەوێتە ڕێ بۆ زیارەتی مەککە و مەدینە و لە ڕێگەی مووسڵەوە ئەڕوا تا ئەگاتە دیمەشقی شام • پاش حەسانەوە ئەچێتە خزمەتی مامۆستای عیلمی حەدیث شێخ موحەممەدی کەزبەری و بۆ بەرەکەت

ئیجازەی ڕیوایەتی ئەحادیثی شەریفەی لێ وەرئەگرێ • هەروا ئەڕوا بـۆ زیارەتی شێخ موصطەفای کوردی کە ئەویش هەر لە دیمەشق بـووە و ئیجازەی ڕیوایەتی حەدیث لەویش وەرئەگرێ و ئیجـازەی تەریقـەتی قادری‌یشی پێ‌ئەدا

لەپاش ئەمە ئەکەوێتە ڕێ بۆ مەدینەی مونەووەرە • لە ڕێگادا بەدەم سۆز و شەوقەوە چەند قەسیدەیەکی فارسی دائەنێ • وا لێرەدا یەکەم بەیتی ئەو قەسـیدانە ئەنووسمەوە :

**(١) ساربانا رحم کن بر آرزومندان زار**
**وعده شد نزدیك ، نبود بعد از این جای قرار**

**(٢) چون منش بیخود کن از ذوق خودی بهر خدای**
**دل ز جا شد تا بکی محمل نمی‌جنبد ز جای**

**(٣) این نه بس یثرب که وصفش چشم شخص عالم است**
**مردمش فخر جهان سالار آل آدم است**

**(٤) السلام ای چهره‌ات شمع شبستان وجود**
**السلام ای قامتت سرو بهارستان جود**

**(٥) ای پناه عاصیان سویت پناه آورده‌ام**
**کرده‌ام بی‌حد خطا و التجا آورده‌ام**

**(٦) سرور عالم من دل داده حیران توام**
**واله و سرگشتهٔ سودای هجران توام**

**(٧) حق آنانی که تا در قید هستی بوده‌اند**
**دم بدم در جستجوی خواهشت افزوده‌اند**

کە لە مەدینەش نزیك ئەکەوێتەوە و کێوەکـانی دەوری شـاری لێ دەرئەکەوێ قەسیدەیەکی‌تر ئەڵێت کە ئەم بەیتە سەرەتاکەیەتی :

**عجایب نشأه‌ای زین دامن کهسار می‌آید**
**تو گویی با نسیم صبح بوی یار می‌آید**

لەپاش ئەم قەسیدەیەش چەند قەسیدەیەکی‌تری لە مەدحی پێغەمبەردا وتووە ، ئەنجا قەسیدەیەکیشی بۆ مەدحی خولەفای ڕاشیدین و ئەصحابەی موهاجیرین و ئەنصار وتووە کە ئەمە یەکەم بەیتیەتی :

**به بزم قدسیان چون نکته از فضل بشر رانم**
**نخستین از مهاجر وانگه از انصار می‌آید**

هەروا بەم سۆز و شەوقەوە ئەگاتە مەدینەی مونەووەرە و زیارەتی ئارامگای پێغەمبەر (د) ئەکا و پاشان ئەکەوێتە گەڕان بۆ دۆزینەوەی یەکێ لە ئەولیا بەڵکو لە بەرەکەتی ئەو وەلی‌یەوە بگاتە ئەو مەبەستەی خۆی • لەم گەڕانەیدا بە خزمەتی پیاوچاکێکی یەمەنی ئەگات • پاش سەلام و دەست ماچ‌کردن داوای ڕێ‌پیشاندان و دڵ ڕوونکردنەوەی لێ ئەکات •

ئەگێڕنەوە ئەڵێن ئەم پیاوچاکە بە مەولانای وتووە بچۆ بۆ مەککە • ئەگەر کەسێکت دی لە دەوری کەعبە کردەوەیەکی ناپەسەندی لێ دەرکەوت پەلەپەل مەکە بۆ ئینکارکردنی کردەوەکەی و دەربڕینی ناڕەزایی لێی ، بەڵکو ئەمە خوایە بە مەبەستی خۆت بگەیت •

کە مەولانا ئەگاتە مەککە سبەینێ‌یەکی ڕۆژی جومعە ئەچێ بۆ بەیت • لەپاش بەجێ‌هێنانی ئادابی زیارەت لە بەرابەری کەعبەدا دائەنیشێ و دەست‌ئەکا بە خوێندنی قورئانی پیرۆز و ( دلائل الخیرات ) • لەوکاتەدا چاو هەڵئەبڕێ کابرایەك ئەبینێ پشتی داوە بە دیواری کەعبەوە و ڕووی‌کردووەتە ئەم ، ئەکەوێتە دڵیەوە کەوا ئەو پیاوە کابرایەکی بێ‌ئەدەبە چونکی پشتی لە کەعبە کردووە و ڕووی کردووەتە ئەم • لەم خەیاڵاتەدا ئەبێ کابرا بانگی لێ‌ئەکا ئەڵێ : تۆ نازانی کەوا حورمەتی ئینسان لای خودا لە حورمەتی کەعبە زۆرترە ، ئیتر بۆچی ڕەخنە لەوە ئەگری کەوا من پشتم لە کەعبە و ڕووم لە تۆیە ؟ ئاخۆ لە مەدینەی مونەووەرە

مەولانا بە بیستنی ئەم قسانە گومانی لەوەدا نامێنێ کە ئـەم پیاوە یەکێکە لە دۆستانی خودا و خۆی بەم جۆرە کردەوانە ئەشارێتەوە • ئەڕوا دەسـتی زیارەت ئەکا و داوای لێبووردن و بەخشینی لێ ئەکا و تـکای لێ ئەکا کە ڕێگای پیشـانبدا و دڵی ڕووناك بکاتەوە • ئەویش لە وەڵامدا پێی ئەڵێ : فوتووحاتی تۆ لەم وڵاتەدا نی‌یە و بە ئیشارە تێی ئەگەیەنێ کەوا لە هیندستانەوە ئیشارەتێکی بۆ دێ و فوتووحاتی ئەو لەوێ‌یە •

مەولانا دڵنیا ئەبێ لەوە کە کاری ئەو لە حیجاز نی‌یە • لـەپـاش بەجێهێنانی ئاداب و مەناسیکی حەج[1] ئەگەڕێتەوە بۆ مەدینە[2] و لەوێوە بۆ شام و بۆ عێراق و لە سولەیمانی لەسەر شێوەی جارانی دەست ئەکاتەوە بە دەرس‌وتنەوە لەگەڵ خواپەرستی‌یەکی زیاتر لە جاراندا • بەڵام هـەر چاوەڕوانی ئیشارەتەکە ئەبێ کە لەسەر فەرموودەی پیاوچاکەکەی مەککە لە هیندستانەوە بۆی بێت •

لەودەمەدا ڕۆژێ دەروێشێك خۆی ئەکا بە مزگەوتی عەبدولڕەحمان پاشادا کە مەولانا لەوێ دەرزی وتوەتەوە • ئـەم دەروێشـە خەڵـکی هیندستان و لە مریدەکانی قوطبی زەمانە شاه عەبدوڵڵای دیهلەوی ( قدس

---

(١) مەولانا کە مەککە بەجێدێڵێ قەسـیدەیەکی ماڵاوایی بۆ ئەڵێ ئەمە سەرەتاکەیەتی :

**وا حسرتا جدا شدم از خانهء خدا**
**از غصه وقت گشته شود دل ز هم جدا**

(٢) کاتێکیش کە مەدینە بەجێدێڵێ ماڵاوایی لە پێغەمبەریـش ئەکا بـە قەسیدەیەك کە ئەمە سەرەتاکەیەتی :

**ای جلوه‌گاه ایزد دادار ، الوداع**
**وی قدوه‌گاه احمد مختار ، الوداع**

سره ) ئەبێ ، ناوی دەروێش موحەممەد و لەقەبی میرزا ڕەحیموڵلا ئەبێ • لەگەڵ مەولانا ئەبێ بە ئاشـــنا و دۆستی و هەموورۆژێ گفتوگۆی لەگەڵ ئەکا • هانی ئەدا کە بەیەکەوە بڕۆن بۆ هیندستان بۆ خزمەتی شاه عەبدوڵلای دیهلەوی بۆ تەریقەت وەرگرتن لەسەر دەستیدا • مەولانا دێتە سەر قسەی و بڕیارئەدا بکەوێتە ڕێ بۆ هیندستان •

## چوونی مەولانا لەگەڵ دەروێش موحەممەددا بۆ دیهلی

مەولانا هەواڵی نیازی سەفەری خۆی بۆ هیندستان لەناو فەقێکانی و لەناو دۆســـتان و برادەرانیا بڵاوئەکاتەوە • هەرچەند بەســـەریا دێن و هەوڵ ئەدەن پەشیمانی بکەنەوە سوودی نابێ • مەولانا ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەکەوێتە ڕێ و ســـولەیمانی بەجـێ ئەهێڵـێ و بــە ئێـرانا لــە ڕێگای موکریانەوە ئەڕوا تا ئەگاتە تاران • لەوێ چەند جار لەگەڵ موجتـــەهیدە بە ناوبانگەکانی شـــیعە کۆئەبێتەوە و ئەکەوێتە گفتوگۆ • بەتایبـــەتی لەگەڵ موجتەهیدێکی ناوداریان کە ناوی میرزا ئیسماعیلی کاشی بووە و لە هەموو عولوومی عەقلی و نەقلیی ئیسلامی شارەزا بووە ئەکەوێتە مونـــاظەرەوە • مەولانا میرزا ئیسماعیل بۆڕ ئەدا و پاشانیش بە شێوەی موجامەلە هەندێ موغالەطەی لەگەڵ ئەکا ، لەوانە ئەوە بووە کە پێی ئەڵێ لەبارەی عیصمەت و بێگوناهیی پێغەمبەرانەوە ئەڵێی چی ؟ میرزا ئەڵێ پێغەمبـــەران هـــەموو مەعصووم و بێگـــوناهن • مەولانا ئەڵێ مادەم وایـــە ئـــەی بۆچی خوا ئەفەرموێت : « عَفَا اللهُ عنكَ لِمَ اذِنْتَ لَهمْ » واتـــە : خوا لێـــت خۆش بێ ، بۆ ڕێگات دان ؟ خۆ تۆ ئەزانی عەفو وائەگەیەنێ کە لەپێش عەفوەکەدا تاوانێك کرابێ ؟ موجتەهیدەکەیش وەڵام ئەداتەوە ئەڵێت : ئەو ئایەتە قســـە لەگەڵ پێغـــەمبەر ناکات بەڵـــکو لەگەڵ ئەبووبـــەکریەتی • مەولانایش ئەڵێ : جا مادەم خوا خەبەری داوە کەوا ئەبووبـــەکری عەفـــو

کردووه ، ئەی ئێوە ، کۆمەڵی شیعە ، بۆ عەفوی ناکەن ؟ لێرەدا میرزا ئیسماعیل شەرم دای ئەگرێ و بێدەنگ ئەبێ • مەولانا ئەم باسەی خستووەتە ناو ئەو قەسیدە عەرەبی‌یەیەوە کە پاش گەیشتنی بە دیهلی دایناوە و سەرەتاکەی ئەم بەیتەیە :

**كَمُلَتْ مَسافَةُ كَعبة الآمالِ**
**حمداً لِمَنْ قدْ مَنَّ بالاكمالِ**

پاش ماوەیەك مەولانا تاران بەجێ‌دێڵێ و ئەچێ بۆ شاری ( بەسطام و خەرقان و سەمنان و نیشاپوور ) و زیارەتی قەبری شێخ بایەزیدی بەسطامی ئەکا و بە قەسیدەیەکی فارسی مەدحی ئەکا کە ئەمە سەرەتاکەیەتی :

**یا رب بحق تربت سلطان بایزید**
**یا رب بقاطعیت برهان بایزید**

پاشان ئەڕوا بۆ شاری ( طووس ) لە خوراسان بۆ زیارەتی ئارامگای ئیمام عەلی ڕەضای کوڕی ئیمام مووسای کاظم و بە قەسیدەیەك کە سەرەتاکەی ئەم بەیتەیە تەعریفی ئەویش ئەکات :

**این بارگاه کیست که از عرش برتراست**
**وز نور گنبدش همه عالم منوراست**

هەروا لە ماڵاوایی‌یشدا لە ئیمام عەلی ڕەضا قەسیدەیەکی‌تر ئەڵێت کە ئەمە سەرەتاکەیەتی :

**( خالد ) بیا و عزم سفر زین مقام کن**
**بر روضهء ( رضا ) بدل و جان سلام کن**

لەوێیشەوە ڕوو ئەکاتە ( جام ) و زیارەتی ئارامگای شێخ ئەحمەدی

نامیقی جامی‌یش ئەگات • ئەنجا ئەچێ بۆ شاری ( هەرات ) لـە وڵاتـی ئەفغان و چاوی بە زانایانی ئەو شارە ئەکەوێ کە یەکێکیان شێخ عەبدوڵلای هەراتی بووە کە پاش گەڕانەوەی مەولانا بووە بـە مرید و بە خەلیفەیشی وەکو لەمەولا باسی ئەکەین •

لە هەراتیشەوە ئەڕوا بۆ ( قەندەهار ) و ( کابول ) و دارولیعلمـی ( پیشاوەر ) و چاوی بە مەلا و زاناکانی ئەم شارەی دوایی ئەکەوێ،ئەوانیش پرسـیاری گەلێ موشـکیلات و گیروگرفتی لێ‌ئەکەن ، ئەمیش وەڵامی هەمووی ئەداتەوە • ئەوە ئەبێ بە مایەی ڕێز و قەدر لێ گرتنێکی زۆری •

لە پیشاوەرەوە ئەڕوا بۆ ( لاهوور ) و لەوێوە ئەچێ بۆ شارۆچکەیەك کە خواناسی گەورە شێخ ثەنائوڵلای دیهلەوی هاوڕێی شـاه عەبدوڵلای دیهلەوی لەوێ نیشتەجێ بووە •

مەولانا خۆی نووسیویە ئەڵێ : شەو لە میوانخانەی شێخ ثەنائوڵلادا خەوم‌دی ، لە خەوما شێخ ثەنائوڵلا گازێکی لە ڕوومەتم گرت و ویسـتی بە دان ڕامکێشـێ بۆ لای خۆی ، بەڵام بۆی ڕانەکێشرام • کە سبەینێ چوومە خزمەتی شێخ ثەنائوڵلا بێ‌ئەوەی من هیچم وتبێ فەرمووی خالید ! بڕۆ بۆ لای برام شاه عەبدوڵلای دیهلەوی• بەجۆرێکیش تێی گەیاندم کەوا فوتووحی من لە خزمەتی ئەودا ئەبێ • لەم قسـانەی شـێخ ثەنائوڵلاوە تێ گەیشتم کەوا هیممەتی خۆی بەکارهێناوە بۆئەوەی بمکا بە مریدی خۆی، بەڵام بۆی ڕێ نەکەوتووە چونـکە هیممەت و جاذیبەی شـێخ عەبدوڵلا بەهێزتر بووە

هەروەها مەولانا خۆی نووسیویە : جا لەو شارۆچکەیە دەرچووم و ڕووم‌کردە دیهلی • بە ماوەی ساڵێك گەیشتمە ئـەوێ • چل ڕۆژ بەرلەوەی بگەمە بەرەوە نیسبەت و نەشئەی بەرەکەتی شێخ عەبدوڵلام بۆ ئەهات •

شێخ عەبدوڵڵا خەبەری دابوو بە هاوڕێ تایبەتی‌یـەکانی خۆی کەوا من بەڕێوەم بۆلای و بۆ خزمەتی ئەو ئەڕۆم •

بەمجۆرە مەولانا ئەڕوا تا ئەگاتە دیهلی و قەسـیدەیەکی عەرەبی لە باسی سـەفەرەکەی و لە مەدحی شـاه عەبـدوڵڵادا دائـەنێ کە ئەمە سەرەتاکەیەتی :

**كَمَلَتْ مسافةُ كعبَة الآمالِ**
**حمداً لِمَنْ قد مَنَّ بالاكمالِ**

پاش حەسانەوە مەولانا بۆ سـبەینێی ئەو شەوە کە ئەگاتە ( جیهان ئاباد ) ، کە ڕێـکەوتی ڕۆژی جومعەی کردووە بە خزمەتی شێخ عەبدوڵڵا ئەگات و شێخ ئادابی تەریقەتی نەقشبەندیی پێ فێر ئەکات • مەولانـا دەست‌ئەکات بە سولووك و بەجێ‌هێنانی ئادابی تەریقەت و هەندێ خزمەتی زاویەیش ئەگرێتە ئەستۆی خۆی • وا مەشهوورە ئـەم خزمەتە بریتی بووە لە سـەقایی کردن و ئاودان بە هەژارانی ئەو شوێنە • بەمچەشـنە مەولانا ڕۆژبەڕۆژ ئەبێ بە جێگای تەوەججوهاتی شێخ عەبدوڵڵا ، بەجۆرێ کە لـە ماوەی پێنج مانگدا مەقامی حوضوور و موشـاهەدەی بۆ پەیدا ئەبێ و سـینەی ئەبێ بە طووری تەجەللی‌یات و ئەنواری حەق بـە جۆرێ کە مورشیدی گەورە مژدەی ئەداتێ بـە گەلێ مژدەی کەشـفی و ئـەوەندە لە حوزووری شێخ عەبدوڵڵادا خۆشـەویست ئەبێ وەك لەپێشـترین خۆشەویستێکی لە دڵیدا جێ ئەگرێ •

بەمشێوەیە مەولانا بەردەوام لە بەرزبوونـەوەدا ئەبێ و مەقـامی (فەنـا) و (بەقا)ی بۆ ڕێ‌ئـەکەوێ و بـە هەموو جـۆرێ ئیستیحقـاقی ئیجازەی ئەبێ • وەکو لە هەندێ نامەی شاه عەبدوڵڵادا نووسـراوە کە مەولانا ئەگاتە ئەم پایەیە شاه عەبدوڵڵا بە ئیشارەتێکی ڕۆحانی لەلایـەن

حەزەراتی گەورە گەورانی ئەولیاوە لە جەماعەتی نەقشبەندی ( قدس الله اسرارهم ) ئیجازەی ئەدا لە هەر پێنج تەریقەتە بەناوبانگەکەدا کە بریتین لە ( نەقشبەندی ) و ( قادری ) و ( سوهرەوەردی ) و ( کوبرەوی ) و ( چەشتی ) • هەروا ئیذنی ئیرشادیشی ئەدا و رێگای ئەدا بۆ ئیجازەدانی حەدیث و تەفسیر و تەصەووف و ئەحزاب و ئەوراد و ئەدعیە و غەیری ئەمانە• ئەم ئیجازە پێدانەی لەپاش ماوەی سالێ ئەبێ لە گەیشتنی بە خزمەتی مورشیدی خۆی • هەروا فەرمانی پێ ئەدات کە چاوی بە عالمی گەورە مودەرریس و واعیظی صۆفی شێخی پیر سال مەولانا عەبدولعەزیزی حەنەفیی نەقشبەندیی هیندییش بکەوێ کە کتێبی ( تحفەء اثناعشریە )ی لە بەرپەرچدانەوەی رافزییەکاندا داناوە کە وێنەی دانەنراوە • ئەویش بە خزمەتی ئەگات و ئیکرام و ئیحتیرامێکی زۆری ئەگرێ و ئیجازەی عیلمیی بۆ هەموو عیلمەکان ئەداتێ و ئیجازەی ئەدا کەوا ریوایەتی کتێبەکانی صیحاح و غەیری ئەوانیش بکات و ئیجازە نامەی بۆ ئەنووسێ و لە ئیجازە نامەکەدا بەمجۆرە ناوی ئەبا «صاحب الهمة العلية في طلب الحق » •

پاش ئەمانە شاه عەبدوللا ئەیەوێ تەوەججوه لە مەولانا بکات و عالمی رەببانی شێخ ئەبوسەعیدی هیندی و وەلیی خواناس شێخ بەشارەتوللا بانگ ئەگا و مەولانا لەنێوانیانا دائەنیشێنێ و لە یەککاتدا رووئەکاتە هەر سێیان و رووی دەم ئەکاتە مەولانا و لێیئەپرسێ : چیت چاو پێ ئەکەوێ ؟ مەولانا ئەفەرموێت : ئەبینم رۆحانییەتی سولطانولئەولیا حەزرەتی عەلیی مورتەضا ( کرم الله وجه ) وا بەسەر شانتەوە • لەویادا شاه عەبدوللا فەیض و بەرەکەتێکی زۆر ئەرێژێ بەسەر حەزرەتی مەولانادا کە ئەنجامەکەی لە پاشەرۆژدا دەرکەوت بە بلاوبوونەوەی تەریقەتی نەقشبەندی بە گەلێ لای ولاتی موسولمانانندا •

# گەڕانەوەی مەولانا بۆ کوردستان

پاش ئەوەی مەولانا ساڵێ لە خزمەتی شـاهـ عەبدوڵڵای دیهلەویدا ئەمێنێتەوە و بە فویووضاتی ئەو ئەگا بە پایەی کەماڵ و ئیجازەی خەلافەت و ئیرشادی لێ وەرئەگرێ ، شـاهـ عەبدوڵڵا ئەمری پێ ئەفـەرموێت کـە بگـەڕێتەوە بۆ کوردستان و دەس بکا بە ڕێگا پیشاندانی ئەوانەی بەدوای ڕێگای خواناسـیدا ئەگەڕێن • مەولانا بە شـاهـ عەبـدوڵڵا ئەڵێ کەوا کوردستان پڕە لە مەلای پایە بەرز و بەحورمەتی وەکوو بەرزنجەیی‌یەکان و حەیدەری‌یەکان و کەسانی‌تر لە خانەدانەکانی عیلم و فەضڵ و حورمەت و پایەی دینی و دنیایی • ئەویش ئەفەرموێت تۆ بڕۆ خەریکی ئیرشادکردنی خۆت بە ، ئەوانە هەموو خزمەتت ئەکەن ، پیاوە هەرە گەورەکانی دنیایش دەست و پێت ماچ ئەکەن • مەولانایش ئامادەیی خۆی بۆ بەجێ‌هێنانـی فەرمانەکانی شاهـ عەبدوڵڵا پیشان ئەدات • ئەنجا شاهـ عەبدوڵڵا لێی ئەپرسێت: ئیتر چیت ئەوێ ؟ مەولانایش ئەفەرموێ : دینم ئەوێ و دنیایشم ئەوێ بـۆ بەهێزبوونی دین • شاهـ عەبدوڵڵا ئەفەرموێت : « برو همەرا بشما دادم » واتە : بڕۆ ، وا هەموویم دایتێ •

پاش ئەمە مەولانا ئەکەوێتە ڕێ بێتەوە بۆ کوردستان • شاهـ عەبدوڵڵا بە خۆی و مریدەکانی تا ماوەی چوار میل بەڕێی ئەکەن و پێشی ئەفەرموێت یەکێ لە ئەولیای گەورە لە شارێ لەم هیندستانەدا هەیە بڕۆ زیارەتی بکە و سـەلامی ئێمەشی پێ‌بـگەیەنە و داوای دوعای خێری لێ بـکە • کـە گەیشتیشیتەوە سولەیمانی بڕۆ زیارەتی ئارامگای حەزرەتی غەوث بکە لـە بەغدا ، جا خوا حافیظیی لێ ئەکا و ڕەوانەی ئەفەرموێت و پێی ئەفەرموێت : « خالد برو » واتە : خالید بڕۆ • کـە مەولانا ئەگاتە ئەو شارە کـە ئەو پیـاوە گەورەیەی تیابـووە ئەچێ بۆ زیارەتی و سـەلامی مەولانای پێ

ئەگەیەنێ و داوای دوعــای خێری لێ ئەکا ، ئەویش بــە خۆشــەویستی وەڵامی ئەداتەوە و دوعای خێر بــۆ ئەویش و بــۆ مەولانایش ئــەکات و پێی ئەڵێ : « خالد برو به بغــداد فتوح شــما در انجااست » واتە : خالید بڕۆ بۆ بەغداد ، دەروو لەوێ لە تۆ ئەکرێتەوە •

بەمجۆرە مەولانا هیندستان بەجێدێڵێ و ئــەکەوێتەڕێ بــۆ بەندەری ( مەسقەط ) و لەوێوە ئەڕوا بۆ ( شــیراز ) و ( هەمەدان ) و ئــەگاتە هەر شوێنێ ئامۆژگاریی خەڵکی تیا ئەکا و ڕاســتییان بــۆ ڕوونئەکاتەوە • تەنانەت لە هەمەدان هەندێ لە شــیعەکان نیازی کوشــتنی ئەکەن ، بەڵام پێوە نابێ و خوا ڕزگاری ئــەکا ، جا لەوێوە ئەڕوا بــۆ ( ســنە ) و چەند ڕۆژێ لەوێ ئەمێنێتەوە و باسی سولووك و حاڵی خۆی ئەکا و موسوڵمانان بانگئەکا بۆ وەرگرتنی ئادابی تەریقەتی نەقشبەندی • زانای گەورە شێخ موحەممەد قەسیمی مەردۆخەیی کە وەختی خۆی مامۆســتای مەولانا بووە خۆی تەســلیم ئەکا و ئادابی تەریقەتی لەســەر دەستدا وەرئەگرێ و ئەبێ بــە مریدی •

ئەوجا لــە ســنەوە ئەکەوێتە ڕێ بــۆ ســولەیمانی و لــە ١٢٢٦ی هیجرەتدا ئــەگاتە ئەوی[1] • زانایان و پیــاوماقووڵانی شــار دێن بــە پێشوازییەوە و بەخێر هاتنەوەی لێ ئەکەن و خۆشیو شــادمانی ئەکەوێتە ناو دۆستان و برادەران و خزمانی •

پاش ماوەیەك حەسانەوە لــە سولەیمانی ، مەولانا بەپێی فەرموودەکەی شاه عەبدوڵڵا تەشــریفی دێ بــۆ بەغدا و لــە بارەگای حەزرەتی غەوث

---

(١) گەیشتنەوەی مەولانا بۆ سولەیمانی ڕێــکەوتی فەرمانڕەوایی خالیــد پاشای کوڕی ئەحمەد پاشای کردووە ، بەڵام پاش چەند مانگێ خالیــد پاشا چووە بۆ بەغدا و عەبدولڕەحمان پاشا بووەتەوە بە ســەرۆك لــە وڵاتەکەدا تا ساڵی ١٢٢٨ •

دائەبەزێ و پێنج مانگ لەوێ لە حوجرەیەکدا ئەمێنێتەوە •

مەولانا لە ١٢٢٦دا بەشێوەی مورشیدێکی خاوەن پایە و بەحورمەت ئەگەڕێتەوە بۆ سولەیمانی و دەس ئەکا بە ئیرشادی موسوڵمانان بۆ تەریقەتی نەقشبەندی[٢] • خەڵکێکی زۆر لە زانایان و مەشایخ و ناودارانی وڵات و میران و دەسەڵات بەدەستان و موسوڵمانانیتر بە شەرەفی مریدی و مەنسوبیی ئەو موشەڕڕەف ئەبن • گەلێکیتریش لە دەرەوەی سولەیمانییەوە دێن بۆ خزمەتی و تەریقەت لەسەر دەستیدا وەرئەگرن • ناوبانگ و شۆرەتی بە وڵاتدا بڵاو ئەبێتەوە • یەکێ لەوانە کە بووە بە مریدی حەزرەتی شێخ عوثمان سیراجوددینی هەورامیی تەوێڵەیی بووە کە پێش گەڕانەوەی مەولانا لە هیندستان لە مزگەوتی حەزرەتی غەوث لە بەغدا نیشتەجێ و خەریکی خوێندن و خواپەرستی بووە و ئەوکاتە بە ( فەقێ عوثمان ) بەناوبانگ بووە • فەقێ عوثمان هەر لە سەردەمی خوێندندا بەدوای مورشیدێکدا گەڕاوە کە تەریقەتی لەسەر دەستدا وەربگرێ و ڕێگای لای خودای پێ بدۆزێتەوە • بۆیە هەر کە لە بەغدا مەولانای ناسیوە ، تەمەسسوکی پێ کردووە •

مەولانا کە لە سولەیمانی بووە بە هاوین چووە بۆ هەورامان و سەردەمی گەرمای لە هەواری ( قەڵاخانی ) و ( حەوش و بارانی ) بەسەر بردووە کە زووتر لە سەردەمی منالی و لە سەردەمی فەقێیەتیدا ئامۆشۆی بۆ ئەو ناوە بووە و شارەزای بووە • هەرچەند چووە بۆ هەورامان خەڵکێکی زۆر لە هەموولایەکی کوردستانی ئێرانەوە هاتوون بۆلای و تەریقەتیان لەسەر دەستیدا وەرگرتووە • لەم سەفەرانەی هەورامانیدا شێخ عوثمان سیراجوددینیش کە هێشتا هەر بە ( فەقێ عوثمان ) مەشهوور بووە لە

---

(٢) ئەم گەڕانەوەیەی مەولانا بۆ سولەیمانی ڕێکەوتی فەرمانڕەوایی عەبدولڕەحمان پاشای کردووە .

خزمەتیدا بووە و خەریکی سـولووکی تەریقەت بـووە • هەروەها لە یەکێ لەم سـەفەرانەیدا مەلا موصطەفای کوڕی مەلا جەلالی خورماڵیش بووە بە مریدی • گەلێ پیاوی ناوداری‌تری ئێران و ناوچەی هەورامانیش چوونەتە خزمەتی و تەریقەتیان لا وەرگرتووە •

کە ناوبانگ و شۆرەتی مەولانا لە هەموولایەکەوە بـڵاو ئەبێتەوە و مرید و مەنسووب لەم‌لا و لەولاوە دائەبارێن بەسـەریدا ، ئەوانـەی کە سوود و قازانجیـان لەگەڵ بوونی مەولانادا لە سولەیمانی یەك‌نەکەوتووە ئەبن بە ناحەزی و دەس‌ئەکەن بە قسە بڵاوکردنەوە لەدژی و گەلێ شـتی ناڕەوا و نادروسـت بەدەمیەوە هەڵئەبەستن و ڕۆژ بە ڕۆژ ئەم جۆرە قسانە ڕوو لە زیادی و زۆربوون ئەبێ • مەولانا هەرچەند حیلم و حەوسـەڵە پیشان‌ئەدا و بە چاکە مامەڵە لەگەڵ ئەم جۆرە کەسانە ئەکا بەڵکو ئەمە خوایە بگەڕێنەوە بۆ سەر ڕێگای ڕاست و گەلێ‌جاریش دوعای خێریان بۆ ئەکا کە خوا چاکیان بکا ، هیچی سوودبەخش نابێ ، ناچار بۆ کوژاندنەوەی ئاگری ئاژاوە و فیتنە ، بەتایبـەتی لەو سەردەمەدا کە ناوچەی بابان پڕبووە لـە پشێوە بەهۆی هەرای نەبڕاوەی نێوان خالید پاشای کوڕی ئەحمەد پاشا و عەبدولڕەحمان پاشای کوڕی مەحموود پاشای گەورەوە ، مـەولانا بڕیار ئەدا لە سـولەیمانی نەمێنێتـەوە تا ئەم ناکـۆکی‌یە نەبێ بە هۆی بەڵا و موحیبەت بۆ موسوڵمانان و نیازی سەفەری بەغدا ئەکا •

## سەفەری دووهەمی مەولانا لە سولەیمانی‌یەوە بۆ بەغدا

کە ناحەز و بەدنیهادان بوختان و قسـەی پڕوپووچی زۆریان بەدەم مەولاناوە بڵاوکردەوە و ، قسـەکانیش ئەگەیشتنەوە بە فەرمـانڕەوای

ڕۆژ ، مەولانا لە دانیشتنی سولەیمانی ماندوو بوو • بۆیە بڕیاری کۆچ کردنی دا و لە ساڵی ١٢٢٨ی هیجرەتدا سولەیمانیی بەجێهێشت و کەوتە ڕێ بۆ بەغدا • مەولانا لە سەردەمی ویلایەتی سەعید پاشای کوڕی سولەیمان پاشای گەورەدا گەیشتە بەغدا و لە مەدرەسەی ( ئەحسائیة ) کە ئەکەوتە کەناری دەجلە لە بەری ڕەسافەوە لە گەڕەکی ڕەئسولقەریە و ئێستا پێی ئەڵێن ( تەکیەی خالیدییە ) دائەنیشێ و زانایان و پیاو ماقووڵان و خەڵکیتر لە هەموولایەکەوە دێن بۆ لای و تەریقەت لەسەر دەستیا وەرئەگرن و دەست ئەکەن بە سولووك •

لەبارەی دامەزرانی حەزرەتی مەولاناوە لەم مەدرەسەیەدا ئیبراهیم فەصیح حەیدەری لە کتێبی ( المجد التالد )دا نووسیویە : لە نزیکی ماڵی ئێمەوە مەدرەسەیەك هەبوو پێیانئەوت ( ئەحسائیة ) وەختی خۆی عەبباسییەکان دروستیان کردبوو • ئەگێڕنەوە حەزرەتی غەوثیش سەردەمێ لەو مەدرەسەیەدا گۆشەگیر بووە و ڕیاضەتی کێشاوە ، پاشان گواستوویەتیەوە بۆ ( بابولئەزەج ) • ئەم مەدرەسەیە بەدرێژاییی ساڵ کۆن بووە و ڕووخاوە • کە مەولانا دێتە بەغدا ئەسعەد حەیدەریی باوکم و سەیید عوبەیدوڵڵای مامم و جاسم بەگی شاوی کە خاڵۆزای باوکم بووە هەوڵیانداوە و بەیارمەتیی سەعید پاشای والی مەدرەسەکەیان ئاوا کردووەتەوە ، جا عەرزی حەزرەتی مەولانایان کردووە کە تەشریفی لەو مەدرەسەیەدا دانیشێ و خەریکی ئیرشاد و تەدریس بێ تیایدا ، ئەویش قوبووڵی ئەفەرموێت و مەدرسەکە ئەبێ بە جێگەی ئیرشاد کردنی و گەلێ کەس سوودی تیا لێ وەرئەگرن• پاش کۆچی مەولانایش بۆ شام خەلیفەکانی و خەلیفەکانی ئەوانیش هەر لەو مەدرەسەیەدا ئیرشادیان کردووە و تا ئەمڕۆیش ئیرشادی هەر تێدا بەردەوامە •

ئیبراهیم فەصیح درێژە بە قسەکانی ئەدا و ئەڵێ : ڕۆژێکیان سەعید

پاشا بە خۆی و دەست و دائیرەیەوە دێ بۆ زیارەتی مەولانا • کە ئەگاتە تەکیە و تەماشای مەولانا و مریدەکانی ئەکات کە هەموو لە زانایانی بەرز بەرز بوون لە حاڵەتی تەبیعی دەرئەچێ و ئەکەوێ بەسەر پێی مەولانادا • کە دێتەوە سەر خۆی داوای دوعای خێر لە مەولانا ئەکا • مەولانایش دوعای ئەنجام چاکیی بۆ ئەکات و بەشێوەی ئامۆژگاری پێی‌ئەڵێ ئاگاداربە سبەینێ هەرکەسێ پرسیاری لە حاڵ و کردەوەی خۆی لێ ئەکرێ ، بەڵام تۆ پرسیارت لە کردەوەی خۆت و هەموو ئەوکەسانە لێ ئەکرێ کە لەژێر فەرمانتدان و خراپەی ئەوانیش لەسەر تۆ ئەژمێررێ چونکە لە سایەی تۆوە ئەتوانن خراپە بکەن• کەواتە پێویستە ئاگات لە خۆت بێ چونکە ڕۆژیکی‌وا بەڕێوەیە دایك لەتاو سەختیی ئەوڕۆژە ئاگای لە منالی شیرەخۆرەی خۆی نامێنێ و دووگیان بەرەکەی لە تاواندا ئەخا و خەڵکت وا دێتە بەرچاو کە سەرخۆش بن ، سەرخۆشیش نین بەڵام بێهۆشی ترسی ئازار و سزای خوان چونکە ئازار و سزای خوا زۆر سەختە • ئیبراهیم فەصیح ئەڵێ لەم‌ماوەیەدا کە مەولانا ئەم ئامۆژگاری‌یانەی بۆ سەعید پاشا ئەکرد ، ئەو بە دەنگی بەرز ئەگریا و ناڕەحەتیی حاڵی خۆی دەرئەبڕی ، تا مەولانا هەستا و چوو دەستی خستە سەر ملی والی و ئەویش ئارام بووەوە و دامرکایەوە ، جا مەولانا چووە ژوورەوە بۆ ناو ماڵی خۆی کە دەرگای لەسەر تەکیە بووە و والی‌یش چووەوە بۆ جێی خۆی ، پاشان مەولانا بەیانی ڕاستیی ئیمان و باوەڕی والیی فەرموو •

پاش‌ئەوە کە مەولانا لە بەغدا دائەمەزرێ ، زانایان و پیاو چاکانی وڵاتان لە هەمووڵایەکەوە ڕووی تێ‌ئەکەن بۆ تەریقەت لێ وەرگرتن و بۆ سوود وەرگرتن لە عولوومی ظاهیری و باطینی لای ئەو • یەکەم‌کەس لە زانایانی بەغدا کە پایەی خەلیفەیی لەسەر دەستی ئەودا وەرگرتووە سەیید عوبەیدوڵڵای حەیدەری بووە • هەروا گەلێ مەلای گەورەی عەرەب و

تورك و كورد هاتوون بۆ لای داخڵی تەریقەتی نەقشبەندی بوون •

## گەڕانەوەی جاری دووهەمی مەولانا لە بەغداوە بـۆ سولەیمانی

تا ئەم ماوەیە وەزعی سولەیمانی گۆڕا و مەحموود پاشـای کوڕی عەبدولڕەحمان پاشا بوو بە فەرمانداری وڵاتی بابان و نێـوانی بەغدا و سولەیمانی باش بوو • جا مەحموود پاشا بە سەفەر هات بۆ بەغدا و چوو بۆ زیارەتی مەولانا لە تەکیەی خالیدییە • کە پایەی حورمەت و ئیرشـادی مەولانای لە تەکیە دی و چاوی پێکەوت کە چۆن گەلێ پیاوی گەورە و زانای بەرزی وڵات لە خزمەتی مەولانادان و حاڵی بوو کەوا ئەمانە هەموو دان بە گەورەیی مەولانادا ئەنێن ، زۆر بە دڵ گەرمی و ئارەزووەوە تکای لێ کرد کە بگەڕێتەوە بۆ سولەیمانی و چاو لە عاجزی و ناڕەحەتییەکانی پێشوو بپۆشێ بۆئەوەی خەڵکی وڵاتەکە زیاتر سوود لە نوور و بەرەکەتی وەرگرن • مەولانایش لەبەر پێوەندی دەروونی بە نیشـتمانەوە و لەبەر خۆشەویستیی خەڵکی وڵاتەکە تکاکەی پەسەند کرد و گەڕایـــەوە بۆ سـولەیمانی •

لە هیچ بەڵگەیەکدا مێژووی ئەم گەڕانەوەیەی مەولانام بۆ سولەیمانی نەدیوە ، بەڵام دیارە یا ساڵی ١٢٣١ یا ١٢٣٢ بووە چونکە تا ساڵی ١٢٣٠ هەر سەعید پاشا والیی بەغدا بووە • لە ١٢٣٠دا عەزڵ کراوە و بەیارمەتیی مەحموود پاشا داوود پاشا بووە بە والیی بەغدا و بەسرە و شارەزوور • لە ساڵانی ١٢٣١ و ١٢٣٢دا نێوانی مەحموود پاشا و داوود پاشا خۆش بووە و مەحموود پاشا توانیویەتی بێ بۆ بەغدا • ئەم نێوان خۆشییە لە سـاڵی ١٢٣٣دا تێکچووە •

هەرچۆن بێ مەولانا هاتەوە بۆ سولەیمانی و مەحموود پاشایش بە ڕاستی خزمەتێکی زۆری کرد و ئەم خانەقا گەورەیە کە ئێستا هەیە لە سولەیمانی بە ناوی مەولاناوە ، ئەو بۆی دروستکردووە • مەولانا لەم خانەقایەدا ئەحەسێتەوە و پاشا هەندێ موڵکی باشیشی وەك دێی(کەماڵان) و چەند دێیەکیتر لەسەر خانەقا وەقف ئەکا بۆ ژیاندنی هەژاران و دانیشتوانی •

مەولانا دەستئەکا بە ئیرشاد و ڕێگا پیشاندانی موسوڵمانان و ، پیاوانی کارامە و ڕاستی پەرست لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوای وڵاتانی ئیسلامەوە ڕووئەکەنە سولەیمانی بۆ وەرگرتنی تەریقەت لەسەر دەستی مەولانادا و بۆ کەڵك وەرگرتن لە زانست و ڕۆحانیەتی ، وەکو شێخ ئیسماعیلی شیروانی و شێخ حافظی ئۆرفەلی و شێخ ئەحمەدی ئاگرەبۆزی و شێخ فەیزوڵڵای ئەرزڕۆمی • زاناکانی بەغدایش کە بووبوون بە مریدی ، ئەهاتن بۆ خزمەتی بۆ سولەیمانی • تەنانەت سەیید عوبەیدوڵڵای حەیدەری هەر لەگەڵ مەولانا خۆیدا هاتووە بۆ سولەیمانی و لەوێ ماوەتەوە لای لە خانەقادا •

لە ماوەیەکی کەمدا خەڵکێکی زۆر بە نووری دەروونی پیرۆزی مەولانا نوورانی ئەبن و تەنانەت لە حەرەمەینی شەریفەین و قودسی پیرۆز و شام و حەڵەب و شارانی عێراقەوە لە عەرەب و کورد ، هەروا لە شەمدینان و ماردین و عینتاب و ئۆرفە و دیاربەکر و وڵاتی ڕۆم و هیند و ئەفغان و داغستان و ماوەرائەننەهر و میسر و عومان و هەندێ وڵاتی ڕۆژاواوە مرید دەستە دەستە ئەهاتن بۆ لای و ، لەوپەڕی وڵاتی مەڕاکیشەوە پیاوچاکی بەناوبانگ شێخ موحەممەدی مەغریبی هات بۆ لای بۆ سولووك کردن و ملی بۆ کەچ کرد • ئەمە هەمووی سەرەڕای زانایانی بەناوبانگی وەکو سەیید ئەسعەد صەدرەددینی حەیدەری و سەیید صیبغەتوڵڵای

حەیدەری و سەیید عوبەیدوڵڵای حەیدەری و مەلا یەحیای مـزووری و مەلا عەبدولڕەحمانی ڕۆژبەیانی و مـەلا عەبدوڵڵای جەلی و شێخ عوثمان سیراجوددینی تەوێڵەیی و مەلا موصطەفای خورماڵی کە هەموو بە گیان و دڵ فەرمانیان لێ وەرگرتووە • تـەنانەت ئـەگێڕنەوە سـەیید ئەسـعەد صەدروددینی حەیدەری کە موفتیی بـەغدا بووە وتوویە ئەگەر مـەولانا فەرمانم پێ بدا کاسەیێ شـیر لەسەر سەرم دانێم و بە بازاڕی بەغـدادا بگەڕێم بەو شیرەوە ، فەرمان بەرداریی ئەکەم • بەشی زۆری مەنسووبەکانی مەولانا لە زانایانی پایەبەرزی ئاینی بوون و ، کەسیتری وەك مەولانا لەناو پیرانی تەریقەتدا هەڵنەکەوتووە ئەو هەموو مەنسـووبەی لە ڕیزی مەلا پایە بەرزەکاندا بیێ •

مەولانا وەك خەریکی ئیرشادی موسوڵمانان بووە لەسەر ڕێ و شوێنی تەریقەتی نەقشـبەندی ، هەروەها چ لە بەغدا و چ لە سولەیمانی دەرسـی عولوومی دینیشـی وتوەتەوە ، دەرسـی تەفسیری قورئان و حەدیثی شەریف و فیقه و تەصەووفی بەدەوام بووە و ، هاوینانیش تەشریفی بردووە بۆ هەورامان و لە گەلێ شوێنا لە شـوێنە خۆش و ئاودارەکان تا گەرما بەسەر چووە ، وەختی بەسەر بردووە •

بیستوومە مەولانا لە یەکێ لەو هاوینەخۆرییانەی هەورامانیدا لـە سەرچاوەی ( حەوش و بارانی ) چەند هۆدەیەك خانوویشی بـۆ خێزان و دەست و پێوەندەکانی کردووەتەوە کە زیاتر مریدەکانی بە شـانی خۆیان بەردیان بۆ بردووە • یەکێ لەوانەی لەم بەردگواستنەوەیەدا بەشدار بوون شێخی سیراجوددین بووە کە ئەوکاتە هێشتا بە ( فەقێ عوثمان ) ناسراوە • ئەو وەستا بەنایە کە خانووەکەی بۆ مەولانا کردووەتەوە ، داوای لێ کردووە چاوی میهرەبانی و لوطفی لە فەقێ عوثمانەوە بێ •

# کۆچ کردنی مەولانا بۆ جاری سێهەم بۆ بەغدا و دوا سەفەری لە بەغداوە بۆ هەورامان و کۆچی یەکجاریی لەوێوە بۆ شام

مەولانا نزیکەی شەش ساڵێك لە سولەیمانی مایەوە [(١)] • لە ئاخر و ئۆخری ئەو ماوەیەدا سەرنجئەدا وەزعی سولەیمانی بەش بەحاڵی ئەو و مریدەکانی باش نی‌یە ، بەتایبەتی جەنگ و ئاشوویێکی زۆریش لەناو بابانەکان خۆیاندا هەر بەردەوام بووە ، ئیتر بەجارێ دڵی لە سولەیمانی و دانیشتن لە سولەیمانی بێزار ئەبێ و لە سبەینێی ٢٥/١٠/١٨٢٠دا کە ڕێکەوتی ١٢٣٦ی هیجرەتی کردووە لەگەڵ حەرەمەکانی[(٢)] ڕێگای بەغدا ئەگرێتەبەر و ماڵ و عەلاقە و پێوەندو مریدەکانی لە سولەیمانی بەجێئەهێڵێ و شێخ عەبدوڵڵای هەراتی ئەکا بە جێنشینی خۆی و لەسەر خانەقای دائەنێ • ئەم شێخ عەبدوڵڵای هەراتی‌یە خەلیفەی مەولانا خۆی بووە و لە سەفەری هیندستاندا ناسیویەتی و پاش ئیجازەی ئیرشاد وەرگرتن و گەڕانەوەی مەولانا بۆ کوردستان ، لەوێوە هاتووە بۆ خزمەتی و بووە بە مریدی و گەیشتووە بە پایەی خەلافەت •

---

(١) واتە پاش گەڕانەوەی لە بەغداوە بۆ سولەیمانی ، شەش ساڵی تیا ماوەتەوە . پێش ئەمجارەش دوو ساڵی‌تر لە سولەیمانی بووە ، ئەمە تێکڕا کردیە هەشت ساڵ .

(٢) ڕیچ ئەڵێ مەولانا لەمکاتەدا چوار ژنی بووە لە سولەیمانی دەرچوون لەگەڵی . بەڵام ئێمە تێکڕا ئاگاداری سێ ژنین لە ژیانی مەولانادا .

که ئەگاتە بەغدا ئەچێتەوە تەکیەی خالیدییە کە جێگای جارانی بووە و چاکتر لەوسا خەریك ئەبێتەوە بە ئیرشادی موسوڵمانان و پەروەردە کردنیان و دەرس وتنەوەوە بە فەقێ و ، زانایانی گەورە لە دەوری کۆئەبنەوە و والیی بەغدا داوود پاشا کە لە ١٢٣٠ یەوە بووبوو بە والی و هێشتا لەو پایەدا مابووەوە حورمەتێکی زۆری ئەگرێ و خزمەتێکی زۆری ئەکا و تەکیەی خالیدییەی بۆ ئاوەدان ئەکاتەوە • مەنسووبەکانیشی لە هەموولایەکەوە دائەبارێنەوە بەسەریدا و ئەکەونەوە وەرگرتنی دەرس و ئامۆژگاری یەکانی •

زانایانی شام و موسوڵمانانی ئەو ناوچەیە چاوەڕوانی سوود وەرگرتن لە بەرەکەتی ئەم ذاتە ئەبن ، چەند جار داوای لێ ئەکەن خەلیفەیەکی بنێرێ بۆ لایان بۆ ڕێگا پیشاندانیان ، مەولانایش شێخ ئەحمەدی هەولێری ئەنێرێ کە خەلیفەیەکی تەواو و خاوەنی تەصەڕوفاتی ڕۆحی و پیاوێکی دەم و دەست و دڵ خاوێن و بەئەدەب بووە • ئەم ذاتە کە ئەگاتە شام و نیشانەی تەوەججوهاتی دەرئەکەوێ ، زیاتر لە جاران زانایانی ئەو وڵاتە ئومێدەواری فەیض و بەرەکەتی مەولانا ئەبن و پەی‌دەرپەی نامەی بۆ ئەنووسن کە تەشریفی بڕوا بۆلایان تا دوور و نزیك لەو وڵاتە بە هاتنی شادمان بین و عولوومی ئیسلامی لەوێ لە جاران زیاتر گەشە بکا ، بەڵام مەولانا بەپێی ( الامور مرهونة باوقاتها ) و ( اذا اراد الله شیئا هیأ اسبابه ) چاوەڕوانی ئەوە ئەبێ ئەسبابی سەفەری بۆ ڕێ‌بکەوێ و جوابی جوانی پێویست بۆ ئەوانە ئەنووسێتەوە کە بانگیان کردبوو بچێ بۆ وڵاتی شام •

لەم‌لایشەوە مەولانا لەبەر پێوەندی دەروونی بە وڵاتی خۆی و بەو خەلیفە و مریدانەیەوە کە لەپاش خۆی بەجێی‌هێشتبوون و ، بەهۆی گەرمای بەغدا و ئولفەتی خێزانیەوە بە هەوای کوێستانەوە و ، بۆ زۆربوونی

سالیکانی ڕێگای حەقیقەت لە کوردستاندا . هەموو ساڵێ هاوینان بەغدای بەجێ‌ئەهێشت و ئەچوو بۆ هەوارەکەی خۆی لە هەورامان و بەم‌جۆرە ساڵانی ١٢٣٦ و ١٢٣٧ و ١٢٣٨ی ڕابوارد • لە ساڵی ١٢٣٨دا کاتێك لە هەوار ئەبێ لە هەورامان ، نامە و داخوازیی لە خەڵکی شامەوە بۆ دێ و لەسەر داوای ئەوان بڕیاری چوون بۆ شام ئەدا •

هەر لەم سەردەمەدا لە کوردستانیشەوە بەهۆی پایە بەرزبوونەوەی مەولانا و بەهۆی ئەوەوە کە موسوڵمانان لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژاواوە ڕووی تێ‌ئەکەن و لە هیندستان و ئێران و ئەفغانستان و تورکیا و عەرەبستانەوە سەرەڕای کوردستان خۆیشی دێنە لای و سوود لە بەرەکەتی وەرئەگرن ، هەروا لەبەرئەوە کە بۆ هەموان ڕوون ئەبێتەوە کەوا مەولانا پیاوێکی گەورە و خاوەن فەیز و بەرەکەتە و تازەکەرەوەی موسوڵمانەتی‌یە ، مەحموود پاشای بابان لەسەر داوای گەورە پیاوانی وڵات ئەچێ بۆ هەوار بۆلای مەولانا و زیارەتی ئەکا و تکای لێ ئەکا بگەڕێتەوە بۆ سولەیمانی و بە یەکجاری تیا نیشتەجێ ببێ •

بەڵام لەسەر بناغەی حەدیثی پیرۆزی « لا يُلدَغُ المؤمنُ من جُحرٍ واحدٍ مرّتينِ » و ، لەبەر زیرەکی و تێگەیشتنی دامەزراوی مەولانا خۆی و ، لەبەر دڵسۆزیی لەئەندازە بەدەری بۆ ئایینی پیرۆزی ئیسلام و ، حەزکردنی لە ئارامیی وڵات و ، بۆئەوەی نەبێ بە بەهانەی هەندێ شتی ناڕەوا و نەگونجاو لەگەڵ کەرامەتی ئایینی پیرۆزی ئیسلام ، هیچ گوێی بە ڕجا و تکای پاشا نەدا و عوزری بۆ هێنایەوە و بێ‌دەنگ و صەدا هەر لە کوێستانەوە بە ڕێگەی (دەیروززوور)دا تەشریفی چوو بۆ شام و لە ساڵی ١٢٣٨ی هیجرەتدا گەیشتە شاری شام (٣) •

---

(٣) لەبەرئەوەی کە مەسەلەی کۆچکردنی دواجاری مەولانا لە سولەیمانی بووە و ئەبێ بەهۆی قسەلێکردنی گەلێ کەس و جاروباریش کەسانی

. . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . .

بێئاگا بە ئارەزووی خۆیان لە مەسەلەکە ئەدوێـن و زیاد و کەم لـە ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژەدا ئەکەن و ڕاستی ئاوەژوو ئەکەن بەجۆرێ کـە ئەبێ بە مایەی ئازاردانی دڵی گەلێکیتر ، ویستم بۆ دەربڕینی ڕاسـتی باسی غەوغا و ئاژاوەی خەڵك بەرابەر بە مەولانا لەم پەراوێزەدا بنووسم و لەسەر مەعلووماتی واقیعی و عیلـمی و بـەراوردکاریی بەڵـگەکان ڕاستەقینەی ئەو کارەساتە و هۆکانی دەربخەم .

مەشهوورە کە مەولانا کاتێ ئیجازەی ئیرشادی لەسەر دەستی شێـخ عەبدوڵلای دیهلەویدا وەرگرت و لە هیندستانەوە گەڕایەوە بۆ کوردستان و هاتەوە سولەیمانی و دەستیکرد بە ئیرشـاد و تەبـەعەی زۆر بوون ، مەرحووم شێخ مەعرووفی نۆدی بوو بە ناحەز و دژی و بوو بە هـۆی دەرچوونی لە سولەیمانی و کۆچکردنی بۆ بەغدا .

ئەمە ئەوەیە کە لەناو خەڵکدا مەشهوورە . بـەلام ئەبێ هوشیـار و ئاگادار بین ئەو ڕووداوە هەروا بەوجۆرە و بەوهۆیەوە نەبوە بەکورتی ، بەڵـکو گەلێ ئەسـبابی واقیعی لەو مەسـەلەیەدا هـەن بوون بەهۆی کۆچکردنی مەولانا . جارێ با پێشان ئەم ڕاستییانە بخەینە بەرچاو :

یەکەم : ئەو تەریقەتە کە مەولانا ئیرشادی خەڵکی بۆ ئەکرد ، تەریقەتی نەقشبەندی بوو . ئەم تەریقەتە هەرچەند لە زەمانی کۆندا بووە و لـە کوردستانیشدا نیشانەی بووە ، بەلام لەو چەرخەدا وەکو تەریقەتێکی ناسراو لە کوردستاندا نەبوە و لەناو خەڵکدا ناوبانـگێکی نەبـوە . لـە تەریقەتی نەقشبەندیدا ئەدەبکردنی مرید لە مورشید زۆر بەقیمەتە . زوربەی مریدەکان لـە بەرابەری مورشیدەکانیانەوە وەکو خزمـەتکار بەرابەر بە گەورەی خۆیان ڕائەوەستن . ئەم حـاڵەتە ئەگەر لەسـەر ئیعتیباراتی فیز و تەکەبور بێ گوناهێکی نابار و ناهەموارە و دین قوبووڵی نـاکات .

یەکێ لە ئادابەکانی تەریقەتی نەقشبەندی ڕابیطەکردنی مورشیـدە ، واتە مرید چاو بەیەکدا ئەنێ و ڕۆحانییەتی مورشیدەکەی خـۆی بـە خەیاڵ حازر ئەکات و وائەزانێ هەمیشە بەرەکەت و پیرۆزی لەلایـەن خواوە ئەگات بە ڕۆحانییەتی پێغەمبەر و لەلای ئەویشەوە ئەگات بـە ئەرواحی ئەولیا و مورشیدیش لە ئەولیایە و لە ڕۆحی ئەویشەوە ئەگات بە دڵی مریدە خاوەن ڕابیطەکە .

ئەم ڕابیطەیە هەرچەند لە نوصووصی هەر چـوار مەذهەبـەکەی ئیسلامدا دەلیل و بەڵگە لەسەر ڕاستی و دروستیی هەیە ، بەلام خەڵکی

. . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . .

هەڕەمە و ئەو مەلایانەی لەم ڕاستی‌یە بێ‌ئاگان ، باش تەماشای ناکەن و ئینکاری ئەکەن و جارجاریش زۆر بەتوندی بەرەنگاری ئەوەستن .

یەکێ‌تر لە ئادابی تەریقەتی نەقشبەندی تەوەججوهـ کردنە کە واتە مورشید لە بەردەمی مریددا دائەنیشێ و هەردولایان چاو ئەنێن بەیەکدا و مورشید ڕووی دڵی خۆی ئەکاتە دڵی مریدەکەی بۆئەوەی ئەو نوور و بەرەکەتەی لە دڵی خۆیدایە بگات بە دڵی ئەو و بەو نوور و بەرەکاتە دڵی لە خەیاڵی خراپ پاك بکاتەوە ، وەك چۆن زەڕەبین بەرابەر بە ڕۆژ ئەگیرێت و بەهۆی نووری ڕۆژەوە کاغەز ئەسووتێنێ ، بەوجۆرە مورشیدیش تەئسیر ئەخاتە ناو دڵی مریدەکەیەوە . ئەمەیش هەروەها لەناو خەڵکا نەبیسراو بووە و خەڵك ئولفەتیان پێوە نەگرتووە و بووە بەهۆی ئەوە کە هەندێ لە مەلایانی بێ‌ئاگا ئینکاری بکەن .

یەکێ لە ئادابی تەریقەتی نەقشبەندی ( ذیکری سیڕڕی )یە ، واتە سالیك بە خەیاڵ بە شێوەیەکی تایبەتی کەلیمەی ( الله ) بەسەر دڵدا ڕابوێرێ و هەناسەی خۆی بگرێ و بەتەنها ئەو کەلیمەیە بەسەر دڵیدا بهێنێ تا دڵی نوورانی ئەبێ و فێری ذیکری سیڕڕی ئەبێ و گەلێ نیشانەی نوورانی‌یەتی و بۆنی خۆش لەناو دڵیدا پەیدا ئەبێ . ئەمەیش هەر لەلای تێکڕای مەلایان نەزانراو و ئولفەت پێوە نەگیراو بووە و لایان وابووە هەر ذیکرێك خاوەنەکەی بە گوێی خۆی نەیبیسێ بێ‌ئیعتیبارە .

دووهەم : هەرکەسێ وردبێتەوە ئەزانێ یەکێ لە هۆ بەهێزەکانی ئاشووب و هەرا لە هەرلایەك حەسوودی‌یە . واتە : کەسێ ئەبینێ هاومالێکی ئەگات بە پایە و مایەیەکی دنیایی وەکو دارایی یا شان و شکۆ یا وەزیفە یا پایەکی دینی وەکو پێشەوایی و خەڵك شوێنی ئەکەون، کابرای حەسوود ئاگری تێ‌ئەچێ و ئەکەوێتە هەوڵدان یا ئەوی‌تر ئەفەوتێنێ یا هەرایەك ئەنێتەوە یا خۆی ئەدا بە قەڵبەیەکدا .

گەلێ لە مەلایانی ناوچەی سولەیمانی کە لە خوێندندا هاوڕێی مەولانا بوون و خۆیان لەو بە باشتر تەماشا کردووە ، لە وەزعی مەولانا و لە پایەی بەرزی لای میرانی بابان و خەڵکی شار و دەوروپشتی ناڕەحەت بوون ، بەڵام دەستیان نەڕۆیشتووە هیچ بکەن . یەکە زانای عیلم و تەریقەتیش لەو ڕۆژەدا لە ناوچەکەدا شێخ مەعرووفی نۆدێ بووە کە مەلایەکی گەورە و مورشیدێکی پایەبەرز بووە و بەهۆی عەشرەت و تایەفەیەوە زۆر خاوەن دەست بووە ، چوونەتە لای فیتنەیی‌یان کردووە و هەرشتێ کە بە عەیبیان زانیوە کردوویانە بە چەند قات و وایان نیشانداوە

. . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . .

که ئەم مەولانایە هاتووە دین تێك‌بدا و ئاشووب بنێتەوە و شتی نارەوا دابمەزرێنێ . ئەویش لەبەر ئامۆشۆ نەکردنی‌مەولانا و دڵساقیی خۆی و سوێندخواردنی ئەوکەسە درۆزنانە ئاڵۆز بووە و بە واجبی ئاینیی خۆی زانیوە لەسەر ئوسووڵی حەدیثی پیرۆزی پێغەمبەر کە ئەفەرموێت «من رای منکم منکرا فلیغیره بیـده ، فان لم یسـتطع فبلسـانه ، فان لـم یستطع فبقلبه » واتە هەرکامێکتان شتێکی ناپەسەندی دی ، بـا بـە دەست بیگۆڕێ و ئەگەر نەیتوانی با بە زمان بیگۆڕێ و ئەگەر هەر نەیتوانی با بە دڵ بیگۆڕێ » تێکۆشاوە و لەدژی مەولانا جووڵاوەتەوە . سەرەنجام کە ڕاستیی بۆ دەرکەوتووە پەشیمان بووەتەوە و شێخ حوسەینی قازی و چەند سەیدێکی‌تری ناردووەتە لای مەولانا بۆ عوزر هێنانەوە .

سێهەم : تاقمی لەو جۆرە مەلایانە ئاشووب‌گێڕتر ئەوکەسانە بوون کە ئیددیعای شێخیەتی و پایەی ئیرشادیان کردووە و لەڕاستیدا خاوەنی ئەو پایەیە نەبوون . ئەمانە بەجارێ ئاگریان تێ‌بەربووە و هەستیان بـە ماڵوێرانیی خۆیان کردووە چونکە مەولانا خاوەنی پایـەیەکی بـەرزی ئاینییوا بووە ئەوان نەیانتوانیوە بە هیچ جۆرێ پیا بگەنەوە . مەولانـا کەسێ بووە بەڕاستی پێڕەویی شەرعی کردووە و کەسێ ئینسافی بووبێ نەیتوانیوە پێچەوانەی شەرعی لەسەر ئیسپات بکات . هەرکەسێکیش چووبێتە تەریقەتەکەیەوە لە ماوەیەکی کەمدا حاڵی گۆڕاوە و دڵ و گیانی نوورانی بـووە .

زوربەی ئەوانەی کـە چوونەتە تەریقەتەکەی مەولاناوە مەلای گەورە گەورە و لە خانەدانی پایەبەرز بـوون وەك شێـخ قەسـیمی گـەورەی تەختەیی و شێخ عەبدولقادری شەمزینانی و مەلا موصطەفای کوڕی مەلا جەلالی خورماڵی و مەلا عەبدوڵلای کوڕی مەلا عەبدولڕەحمانی جەلیـی کۆیی و مەلا یەحیای مزووری و شێخ ئیسماعیلی هەنارانیی بەرزنجەیی و شێخ ئەحمەدی سەرداری سەرگەڵوویی بەرزنجەیی و ئەم‌جۆرە کەسانە کە بەهۆی شوێن‌کەوتنیانەوە بۆ مەولانا عالەمەکە بەجارێ سەرگەردان بووە و سەرسام بوون لەمە کە ئەبێ مەولانا چۆن پیاوێ بێ کەسانی وەك ئەمانە ببن بە مرید و مەنسووبی .

بەم‌چەشنە کەرتە شێخەکان بەجارێ ئاگریان تێ‌چووە و چارەیـان نەماوە مەگەر هاتوچوو کردن و پەنابردنە بەر شێخ مەعرووفی نۆدێ و بوختان و درۆکردن لە خزمەتیدا وەك پێشتر باسم‌کرد .

بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمەشدا بە بیر و ڕای من هۆی هەرە گەورەی

کۆچی مەولانا لە سولەیمانی ئەمانە نەبوون کە باسمان‌کردن . بەڵکو ترسی مەحموود پاشای بابان بووە . برا و ئامۆزاکانی پاشا و هەروا گەلێ لە پیاوماقووڵانی بابان لەگەڵ مەولانا جۆرە پێوەندی و مەنسووبی‌یەتێکیان بووە و خۆشیان ویستووە . هەرکاتێ مەولانا ئیشارەتێکی کردبێ هەموو ئەمانە لە بەردەستیدا بوون . بۆیە مەحموود پاشا زۆر لەوە ترساوە کە ڕۆژێ لە ڕۆژان مەولانا داوا بکا لێ‌یان شوێنی پاشا نەکەون و لەگەڵ کەسێکی‌تر بن و زانیویە ئەمانە دەس‌بەجێ فەرمانەکەی مەولانا بەجێ‌دێنن . لەبەرئەوە حەزی لە مانەوەی مەولانا نەبوە لە سولەیمانی و هەمیشە ویستوویە جێی پێ لەق بکا .

ئەگەر مەسەلە ئەمە نی‌یە ، ئەی پاشا بۆ نەهاتووە ئەنجومەنێکی مەلا گەورەکان پێکەوە بنێ بۆ موناقەشە و موجادەلە لەگەڵ مەولانا و لێکدانەوەی ئەو ڕەخنانەی لە مەولانایان گرتبوو ؟ بۆچی خۆی وەك سەیران‌کەر تەماشای ڕووداوەکانی ئەکرد؟ ئەی بۆچی پاش کۆچی یەکەمی مەولانا لە سولەیمانی کە حاڵی بوو مەولانا چۆن پیاوێکە و بوونی لە ناوچەکەدا مایەی شەرەف و شان و شکۆیە بۆ هەموان ، چوو تکای لێ کرد و هێنایەوە ، کەچی دیسانەوە یارمەتیی نەدا و پارێزگاریی نەکرد تا بەجارێ مەولانا دڵگران بوو لە وڵاتەکە و غەریبیی ئیختیار کرد ؟

ڕاستەکەی مەولانا خالید ئەوەندە خاوەن فویووضات و ڕێژەن بووە لە مەلایەتی‌دا تەنانەت کەسانی بێ‌قابیلەتیش بەشێکیان لە بەهرەی ئەو دەسگیر ئەبوو . ئەوانەش کە قابیلەت‌دار بوون لە خزمەتیا ئەبوون بە مەلای گەورە و شایان و لێ‌هاتوو . لە عولوومی مەعنەوی و ڕووناك‌کردنەوەی دڵ و دەروونیشدا سوودێکی زۆریان لێ وەرئەگرت بەجۆرێ کە لە ماوەیەکی کەمدا ئەبوون بە ڕێ‌نموونی‌کەری خەڵکێکی زۆر. لەم‌ڕووەوە خەڵکێکی زۆر لە مەولانا خڕئەبوونەوە و هەمیشە لە دەوروپشتی مەولانادا جەماوەرێکی زۆر لێشاوی کردبوو .

هەر لەبەر ئەم هۆیە بووە کاتێ کە مەولانا لە بەغدا بووە لە سەردەمی والی‌یەتیی داوود پاشادا ، خەلیفە لە ئەستەمووڵەوە نامەیەکی نهێنی ئەنێرێ بۆ بەغدا و ئەپرسێ ئاخۆ ئەم هەموو خەڵکەی دەوری مەولانا لەبەرچی و بەهۆی چی‌یەوە لێی کۆبوونەتەوە ؟ ئاخۆ تەماعی دنیایی مەولانا چۆنە و لە دنیادا بەتەمای چی‌یە ؟ ئەویش لە وەڵامی خەلیفەدا ئەنووسێتەوە ئەم ذاتە مەظهەری فویووضاتی ئیلاهی و مەناری ئەنواری خودایە و جاذیبەی ڕۆحیی لە پایەیەکدایە چۆن میغناطیس ئاسن

ڕائەکێشێ ، ئەویش وا دڵ و دەروونی ئینسان داگیر ئـەکا و ڕوونـی ئەکاتەوە و بەرەو لای خودای ئەبا و ئەیخاتە سەر ڕێی طاعەت و پێڕەوی کردن لە سوننەتی پێغەمبەر دروودی خوای لێ بێ . ئارەزوویشی لە ماڵی دنیا وەکو ئارەزووی شازادەیەکی لاوە لە کاتی تێریدا لە پارچە کولێرەیەك کە سەگێکی گڕوێ بە لیکی دەمی تەڕی کردبێ .

هۆیەکی تری نەمـانەوەی مەولانـا لە وڵاتی خۆمـاندا ئەوەیـە وەك بەراوردکراوە پیاوی گەورەی کوردەواری ئەگەر کەنـار نەبێ لە خەڵك ، واتە لە کێوێ یا لە شیوێ یا لە پەنایەکدا نەبێ و بێ‌یەوێ لەناو کۆمەڵی شارەوانیدا بژی دەوام‌ناکا ، چونکە لای ئێمە وا بووە بە باو قـەدری کەسانی خزمەتگوزار و گەورەی خۆمان ناگرین مەگەر ئەوکەسە خـاوەن عەشرەت و دەسەلاتێکیوا بێ خەڵك لێی بترسن ، بەڵکو ئەگەر خـاوەن عەشرەت و دەسەلاتیش بێ هەر هەراسان ئەبێ لە خەڵکی وڵاتەکە و ، چەند جار ئەم ڕاسـتی‌یە بەراورد کراوە . تەنانەت شێخ مارفی نۆدێ خۆیشی کە بە بەربەرەکانێ‌کەری مەولانا دانراوە ، ویستی لە کوردستان کۆچ‌بکا و داوای ئیزنی لە سوڵتانی ئەستەموول کرد ، بەلام سوڵتـان ئیزنی نەدا . کاك ئەحمەدی شێخی کوڕیشی زۆر زۆر لە وڵاتی خـۆی وەڕس بووەو تەنها لەبەر عەشرەتەکەی ماوەتەوە کە نەیانهێشتووە وڵاتی سـولەیمانی بەجێ‌بهێڵێ . مەولانـا خالیدیـش هـەروا وەڕس بـوو سولەیمانیی بەجێ‌هێشت .

مەبەستم لەم درێژە پێدانە ئەوەبوو هۆی دەرچـوونی مەولانـا لـە سولەیمانی گەلێ شتی زۆر لە نێوان تێکچوونی ئەوو شێخ مارفی نۆدێ موهیمتر بووە . ئەوو شێخ مارف پاشان ئاشت‌بوونەتەوە و نێوانیـان چاك‌بوەتەوە ، بەلام ئەو هۆ موهیممانە ئەوساش بوون و ئێستاش وێنەیان بۆ ڕووداوی‌تر هەیە و گەرد و تۆزی تەبیعەتی وڵاتی خۆ نەناس تا دنیـا دنیایە تەواو نـابێ .



وا من لێرەدا بیر و ڕای خۆمم لەبارەی هۆی کۆچ‌کردنی مەولاناوە لە کوردستان بۆ شام نووسی . ئاشکرایە لەم‌بارەوە زۆر شت نووسراوە و ئەم شتانە لەو کتێبانەدان کە بۆ لەسەرکردنەوەی مەولانا یا لەدژی مەولانا نووسراون . لەم مەیدانەدا قسەی کەسێکی‌تریش هەیە شایانی ئەوەبێ ئاگاداری بین . ئەم قسەیە قسەی گەڕاڵی ئینگلیز ( کلۆدیۆس جەیمس ڕیچ )ی نوێنەری کومپانیی هیندی ڕۆژهەڵاتی ئینگلیزی‌یە کە لـە بەغدا

دانیشتووه و لەو سەردەمەدا گەشتێکی لە بەغداوە کردووە بۆ سولەیمانی و کوردستانی بەشی ئێران .

کلۆدیۆس جەیمس ڕیچ لەو سەردەمەدا کە مەولانا سولەیمانیی بۆ دواجار بەجێ‌هێشتووە لەوێ بووە . هەروا لە سەردەمی بردوی شان و شکۆ و پێوەندیشی لەگەڵ میرانی بابان هەر لەوێ بووە . ئەم پیاوە لە هەردوو حاڵەتەکەدا باسی مەولانا ئەکا . ئێمە بە نیازی ئەوە نا کە قسەی ئەم پیاوە بکەین بە بەڵگە . هەرچەند مەشهوورە ( والفضل ما شهدت به الاعداء ) و دیاریشە کابرایەك کە بە نیازی پێچەوانەی سوودی وڵاتانی ئیسلام و موسوڵمانان هاتبێتە ئەم وڵاتە ، بە دۆستی پێشەوایەکی موسوڵمانانی وەك مەولانا خالید دانانرێ . بەڵکو هەر بۆ ئاگاداری‌یەکی وردتر و ڕوونتر . لە دوادواییی بیر و ڕا تایبەتی‌یەکەی خۆمەوە لەمەڕ کۆچی مەولانا کە پێوەندێکی تەواوی بە پێوەندیەوە [ پێوەندی مەولانا ] بە میرەکانی بابانەوە هەیە ، زوربەی ئەو بڕگانە وەرئەگێڕمە سەر کوردی کە ڕیچ لە کتێبەکەیدا لەبارەی مەولاناوە نووسیونی . وەك لیوا بەهائەددین نووری وەری‌گێڕاوەتە سەر عەرەبی .

ڕیچ لە لایەکی کتێبەکەیدا ئەڵێ :

« موسوڵمانێکی دەست لە دنیا داشتووی گەورە لە سولەیمانی ئەژی ، ناوی شێخ خالیدە . بەڵام کوردەکان لایان‌وایە سووکی‌یە بۆی لە ( حەزرەتی مەولانا ) بەولاوەی پێ بووترێ . موسوڵمانەکان قسەکانی لە پلەی حەدیث ای پێغەمبەر ادا دائەنێن . ئەم شێخ خالیدە لە خێڵی جافە، تەریقەتی نەقشبەندیی هەیە ، لە دیلهی لەسەر دەستی سۆفیی بەناوبانگ سوڵتان عەبدوڵلادا چووەتە سەر ئەم تەریقەتە . دوازدە هەزار مریدی لە ناوچە جیاجیاکانی تورکیا و وڵاتانی عەرەبدا هەیە . کوردەکان هەموو بە وەلیی دائەنێن . زۆریشیان لە ڕیزی پێغەمبەری خۆیانیدای ڕیز ئەکەن . عوثمان بەگ پێی‌وتم ئەویش و پاشایش و بەڵکو هەموو سەرکردە کوردەکانیش مریدی ئەون . شێخ خالید هیچ نەبێ لەگەڵ وەلیی موسوڵمان شێخ عەبدولقادر [ مەبەست حەزرەتی غەوثە ــ و ] ی بەناوبانگدا لە یەك پلەدان » .

**[ کلودیوس جیمس ریچ ، رحلة ریچ في العراق عام ١٨٢٠ ، الجزء الاول، نقلها الى العربیة بهاءالدین نوری ، ص ٩٨ ، بغداد ١٩٥١ ] .**

ڕیچ لە لایەکی‌تری کتێبەکەیدا شتێکی‌تر ئەگێڕێتەوە نیشانەیەکی گەورەی پایەی مەولانایە لای میرانی بابان . ڕیچ ئەڵێ :

« .. کە سەرەنجام ، پێش ماوەیەکی کەم ، مەحموود پاشا بڕیاری‌دا خۆی بدا بە دەست تورکەکانەوە ، لەگەڵ عەبدوڵلا پاشای مامی و عوثمان و

# گەیشتنە شامی مەولانا

کە مەولانا ئەگاتە شام کۆمەڵێکی زۆر لــە زانایان و ئەدیبان و پیاو ماقووڵان و کاربەدەستانی گەورەی دەوڵەت و خەڵکیتری بەپێشوازییەوە ئەچن و قەدر و حورمەتێکی زۆری لێ ئــەگرن و ، هەندێکیش لە ئەدیبان پارچە شیعر و غەزەل و قەسیدەی جوان جوان لە تەعریف و ستایشکردنیدا

---

سولەیمانی برای چوون بۆ لای شێخ خالید ، پیاوی لەخواترسی گەورەی ئەو سەردەمەی سولەیمانی . هەر سێ [ عەبدوڵڵا پاشــا و عوثمان و سولەیمان ] سوێندیان خوارد کە ملکەچ بن بۆ مەحموود پاشا . لەبەرئەوەش کە بەدووریان نەئەزانی میری کرماشان هەوڵبدا دڵی یەکێکیان ڕابکێشێ بۆ لای خۆی و هانی بدا لەدژی پاشا بۆ دوژمنایەتی لەگەڵ تورکەکان، دەستیان نایە سەر شمشێر و سوێندیان خوارد بە قورئان و تەڵاقیان خوارد کەوا هەرکامێکیان نامەیەکی لە تورکیا یا لە ئێرانەوە بۆ هات، لە ماڵی شێخ خالیددا هەڵیپچڕێ بە حوزووری هەرکەس کە هەر چواریان بڕیاری لەسەر بدەن .. » .

[ سەرچاوەی پێشوو ، لاپەڕە ١٠٣ ]

بۆ جاری دوایش ڕێچ باسی مەولانا ئەکاتەوە و ئەڵێ :
« ٢٥ی تەشرینی یەکەم .

« ئەم بەیانییە شێخ خالیدی بەناوبانگ هەڵات . لەگــەڵ ئەوەش کــە هەڵاتنەکەی لەپڕ و بــە نهێنی بوو ، توانی هەر چوار ژنەکەی لــەگەڵ خۆی بەرێ . هێشتا نەزانراوە بەرەو کوێ ڕۆیشــتووە . چەنــد ڕۆژێ لەمــەوبەر کوردەکان لە پلەیەکی بەرزتر لە پلەی عەبدولقادر [ مەبەستی حەزرەتی غەوثە ــ و ]دا دایانئەنا . پاشا عادەتی وابوو لە بەردەمیا ڕائەوەستا قلیانی بۆ تێئەکرد، کەچی ئەمڕۆ پێیئەڵێن کافر و ، داســتانی زۆر لەبــارەی فیز و کافــری و زیندیقییەوە ئەگێڕنەوە» . ئەنجا ئەڵێ : « لەبارەی هۆی هەڵاتنیــەوە قســەی جۆرجۆر ئەکرێ . هەندێ ئەڵێن دەستی کردبوو بە ئاژاوەنانەوە لەنێوان پاشا و براکانیدا کە ویستبوویان لای پاشا لەگەڵی ڕووبەڕوو ببنەوە .. هەندێکیکەش ئەڵێن دەستی کردبوو بە دانانی بناغەی مەزهەبێکی نوێ و ئەیویست خۆی بکا بە گەورەی دنیایی وڵاتەکە . بێگومان زۆر شتی لەبارەوە وتراوە و شتی زۆر لەوە زیاتری دراوەتە پاڵ کە لەڕاستــیدا بشێ بدرێتــە پــاڵی . مــەلاکان و سەییدەکان و لە سەرووی هەموویانەوە شێخ مارف ، هەموو ڕقیانە لە شێــخ خالید کە کاتێ کە دەسەڵاتی بەدەستەوە بوو هەمووی بەزاندبوون ... » .

[ سەرچاوەی پێشوو ، لاپەڕە ٢٢٧ ــ ٢٢٨ ]

ئەنووسن(١) • ئەوانەی کە بەدوای سولووکی ڕێگەی حەقیقەتدا ئەگەڕێن بەجارێ سنگی خۆیان ئەکەنەوە بۆ داخلبوون بە طەریقەت و بۆ سولووك لە خزمەتیدا ، هەروەها بۆ کەڵك وەرگرتن لە زانستی زۆری لە مەیدانی هەموو زانستە ئیسلامی‌یەکاندا ، چونکە مەولانا وەك خەریکی طەریقەت و سولووك و تەصەووف بووە ، لە هەمان‌کاتدا مەدرەسەیەکی گەورەشی بووە خزمەتی زانست و دینی تیا کردووە و فەقێ لە هەمووولایەکی ولاتانی ئیسلامەوە بۆ خوێندنیش ڕوویان تێکردووە • بەمجۆرە کەسێ تەماشای حەڵقەی دەرسی مەولانای کردبێ وای‌زانیوە بوخاری‌یە زیندوو بووەتەوە بۆ ڕیوایەتی ئەحادیثی شەریفە ، یا شافیعی‌یە خەریکی تەفریعاتی ئەحکامی فیقهە • کەسێکیش لە حەڵقەی سولووکیدا دانیشتبێ وای‌زانیوە ئیمامی ڕەببانی‌یە خەریکی ئیرشادی سالیکانە •

مەولانا کە عێراقی بەجێ‌هێشت و لە شامدا نیشتەجێ بوو ، شێوەکەی لەوە ئەچوو پادشایەك قەرارگای حوکوومەتەکەی و پێتەختی ولاتەکەی بگوێزێتەوە ، چونکە کە کەمێك تەماشای وەزعی نامەنووسینی نێوان مەولانا و خەلیفە و مریدەکانی ئەکەین و وەڵام یا نامەکانی مەولانا ئەخوێنینەوە وامان دێتە پێش چاو کە پادشایەك فەرمان بۆ والی و سەرلەشکرەکانی خۆی لەملا و لەولای ولاتەکەی دەربکا •

کەسانی وەك شێخ عوثمان سیراجوددین لە بیارە و تەوێڵە لە هەورامانی بەشی عێراق و ، مەولانا مەلا ئەحمەدی کۆڵەسارەیی لە ولاتی بێڵەوار لەنێوان سنە و کرماشان و ، شێخ موحەممەد قەسیمی مەردۆخەیی لە سنە و ، شێخ طاهای نەهریە لە

---

(١) وەك شێخ موحەممەدی کوڕی شێخ عەبدوڵلای خانی و شێخ شاهێنی عەتتار و شێخ مووسای سیباعی و شێخ موحەممەدی جوملەی حەنەفیی دیمەشقیی خەڵوەتی و کەسانی‌تریش •

ولآتی نەهریَ و ، شێخ ئەحمەدی سەردار لە ساداتی بەرزنجە لە سەرگەلوو و ، شێخ مەلا عەبدوللای جەلی لە کۆیە و ، شێخ طاهیری بامەڕنی لە دەوروبەری ئاکرێ و ، خەلیفەکانی بەغدای وەکو شێخ عوبەیدوللای حەیدەری ، ئەمانە هەموو لە شوێنی خۆیانا هەریەکی نوێنەرێکی بەقەدر و قیمەتی مەولانا و ئاوێنەیەکی بالآنمای ئەو بوون • لە هەمان‌کاتا هات‌وچووی هەمیشەی مریدەکانی بە نامەی خەلیفەکانیەوە بۆ پرسیار بۆ چارکردنی گیروگرفتە ماددی و مەعنەوی‌یەکانیان و بۆ داواکردنی زیادە تەوەججوهات و بۆ دەرمان‌کردنی دەردی ئەوانەی کە گیرۆدەی زەمانە و برینداری تەنگو چەڵەمەی جۆربەجۆر بوون ، وەك هات‌وچووی پۆستەی ئەم سەردەمە بەردەوام بووە •

ئەو نامانەی کە مەولانا بۆ دەوروپشتی نووسیون بە عەرەبی یا بە فارسی کە لەو سەردەمەدا بە فارسی نووسین لە ولآتی باباندا باو بووە ، بەشێکی زۆر لە ئەحوالی خەلیفە و مرید و مەنسووبەکانی مەولانا نیشان ئەدەن •

## سەفەری مەولانا بۆ قودس و سەفەری دووهەمی

## بۆ حەج و زیارەتی ئارامگای پێغەمبەر (د)

مەولانا پاش دامەزران‌و حەسانەوەی لە شام ، بە نیازی ڕێ‌پیشاندانی موسوڵمانان و بە مەبەستی زیارەتیش سەفەرێکی قودس ئەکا و لەوێیش کۆمەڵێکی زۆر لە زانایان و پیاوماقووڵانی ئەو ناوچەیە و لە خەلکی‌تر تەمەسسوك لەسەر دەستیدا ئەکەن و ئەبن بە مریدی • وەك لە نامەکانی مەولاناوە دەرئەکەوێ لە ناوچەی فەلەستینیش خەلیفەی هەبوە •

که له قودسەوە ئەگەڕێتەوە بۆ شام تا ساڵی ١٢٤١ی هیجرەت سەفەری هیچ کوێی نابێ و هەر خەریکی ئامۆژگاری کردنی موسوڵمانان و دەرزوتنەوە بە فەقێیان و تەریقەت دادانی ئەوانە ئەبێ کە ئارەزوویان لە تەریقەت و سولووك بووە • لە ساڵی ١٢٤١دا بە نیازی زیارەتی مەدینەی مونەووەرە و ئارامگای پێغەمبەر ( دروودی خوای لێ بێ ) و لەوێیشەوە بۆ حەج لە شامەوە ئەکەوێتە ڕێ • لەوێ کۆمەڵێکی زۆر لە موسوڵمانان بەتایبەتی لە زانایانی خاوەن پایە و لە پیاوماقوولان کە هاتبوون بۆ حەج بە خزمەتی مەولانا ئەگەن و تەریقەت لەسەر دەستیدا وەرئەگرن • مەولانا پێش ئەم سەفەرەش لە مەککە خەلیفەی بووە •

## کۆچی دوایی مەولانا

پاش بەجێهێنانی ئادابی زیارەت و جێبەجێکردنی پێویستییەکانی حەج ، مەولانا ئەگەڕێتەوە بۆ شام و لەسەر ڕێ و شوێنی عادەتیی خۆی خەریکی بڵاوکردنەوەی شەریعەت و تەریقەت ئەبێ تا لە ساڵی ١٢٤٢دا ، واتە ساڵێك پاش گەڕانەوەی لە سەفەری حەج . لە شەوی چوارشەممەی یازدەی مانگی (ذی القعده)دا تووشی نەخۆشیی تاعوون ئەبێ و لە شەوی جومعەی سیازدەی هەمان مانگدا ، لەنێوان نوێژی شێوان و خەوتناندا ، وەفات ئەکا •

پاش شۆردن و کفن کردنی ، ئەو شەوە خەلیفە و مرید و مەنسووبەکانی تا سبەینێ قورئانی لەسەر ئەخوێنن • سبەینێ جەنازەکەی ئەبەن بۆ مزگەوتی ( یەلبەغا ) و خەڵکێکی زۆر حازری نوێژەکەی ئەبن و شێخ عەبدولڕەحمانی کەزبەری گەورەی زانایانی شام پێش نوێژیان ئەکات • پاشان جەنازەکەی هەڵئەگرن بۆ ئارامگای یەگجاریی بەسەر بەرزاییی ( قاسیوون )ەوە و دیسانەوە نوێژی لەسەر ئەکەنەوە و ئەمجارە شێخ موحەممەدی ئیبنوعابیدین پێش نوێژیان ئەکات •

# وەسیەتی مەولانا

مەولانا لەپێش وەفاتیدا بە چەند ڕۆژێ لای هەندێ لە خەلیفەکانی دەری بڕیوە کەوا نزیکە بە ویصالی لەگەڵ دۆستی ڕاستەقینە کە ذاتی خوایە، شاد بێ .

هەروەها چەند ڕۆژێ لەپێش وەفاتیدا ، شێخ موحەممەد ئەمین ئیبنو عابیدین کە زانایەکی زۆر گەورە و خەلیفەی مەولانا بووە لە خەویدا ئەبینێ کە حەزرەتی عوثمانی کوڕی عەففان وەفاتی کردووە و جەنازەکەی هێنراوە بۆ تەکیەی مەولانا بۆ شۆردن و کفن کردن و نوێژ لەسەرکردنی . ئیبنو عابیدین سبەینێ خەوەکەی ئەگێڕێتەوە بۆ مەولانا . مەولاناش ئەفەرموێت لەوانەیە ئەوە من بم کە لە نەوەی حەزرەتی عوثمانم و ئەو جەنازەیەش جەنازەی من بێ و بەم زوانە بمرم .

مەولانا هێشتا کە ساغ بووە سەیید ئیسماعیلی غەززی کە ژن برا و خەلیفەی بووە ، بانگ ئەکا . هەروا چەند کەسێکیش لە خولەفا و مەنسووبین بانگ ئەکا و ئەیانکا بە شاهید کەوا لەپاش وەفاتی خۆی شێخ ئیسماعیلی هەناری خەلیفەی موطلەقی بێ بۆ ڕێپیشاندانی موسوڵمانان و بەسەر هەموو خەلیفە و مریدەکانیا فەرمانڕەوا بێ و ، وەصییش بێ بەسەر ماڵ و منداڵەکەیەوە بۆ خزمەت کردن و بەڕێوەبردنیان لە هەموو بابەتێکەوە تا بمێنێ و ، پاش ئەویش شێخ عەبدوڵلای هەراتی و پاش ئەویش شێخ عەبدولفەتتاحی عەقرەیی [1] . مەولانا ئەفەرموێت مادەم ئیسماعیل هەبێ ،

---

(١) ئەمەی نووسیم لە (المجد التالد)ی ئیبراهیم فەصیح حەیدەریم وەرگرتووە . ئیبراهیم فەصیح خۆی و باوك و باپیرە و مامی خەلیفە و مەنسووبی مەولانا بوون و ، هەمیشە یەکێکیان لای مەولانا بووە یا نامە لەنێوانیانا هاتووە و چووە و ئاگایان لە ساغی و نەخۆشی و وەصیەت و ئامۆژگاریی مەولانا بووە .

من وەکو مردبم وایە • هەروەها وەصیەت ئـەکا کە هـەموو مولـکەکانی کوردستانی بۆ شێخ مەحموود صاحێبی برای بن • جارێکیتریش هەمـوو خەلیفەکانی ولاتی شامی کۆئەکاتەوە و ئەم وەصیەتەیان بەناوا ڕائەگەیەنێ و فەرمانیان ئەداتێ کە یەك بن و یەك دڵ بن و یارمەتیی یـەکتر بدەن لـە ڕێگای ئیسلامەتی و موسوڵمانەتیدا • هەروا وەصیەت ئەکا کە سێیەکی ماڵی بۆ هەژاران بێ •

## جێنشینەکانی مەولانـا

لەسەر وەصیەتی مەولانا لەپاش سپاردنی بە خاك ، شێخ ئیسماعیلی هەنارانی لە تەکیەدا دائەنیشێ و خەریکی ڕێپیشاندانی موسوڵمـانان و خزمەتی ماڵی مەولانا ئەبێ ، بەڵام ئەویش هەر پاش وەفاتی مەولانـا بـە

---

بەڵام خاوەنی (روض البشر في اعيان دمشق في القرن الثالث عشر) کە شێخ موحەممەد جەمیلی شەطڵی حەنبەلی‌یە و مەنسـووبی مەولانـا نەبوە و نزیکەی هەشتا و پێنج ساڵ پاش وەفاتی مەولانـا کتێبـەکەی داناوە ، ئەڵێ مەولانا لە نەخۆشیی وەفاتیا چوار کەسی بەم ڕیزە دیاری کردووە : (١) سەیید ئیسماعیلی هەنارانی (٢) شێخ موحەممەد ناصیح کە یەکێك بووە لە خەلیفە گەورەکانی (٣) شێخ عەبدولفەتتاحی عەقرەیی (٤) سەیید ئیسماعیل ئەفەندیی غەززەیی کە خەلیفە و ژنبرای بووە و ، ناوی شێخ عەبدوڵلای هەراتی لەناوا نی‌یە .

شێخ موحەممەدی خالیش لە (الشيخ معروف النودهي)یەکەیدا ئەڵێ : وەصیی سێهەم کە مەولانا دایناوە شێخ موحەممەد ناصیح بووە و ناوی شێخ عەبدولفەتتاحی عەقرەیی ناهێنێ . ئەشڵێ بەڵام شێخ موحەممەد ناصیح لەپاش وەفاتی سەیید ئیسماعیلی هەنارانی بـە چەنـد ڕۆژێ وەفاتی کردووە ، بۆیە شێخ عەبدوڵلای هەراتی لە ناسـاغیی وەفاتیدا شێخ عەبدولفەتتاحی داناوە بە جێگەداری خۆی . کەوابێ ئەبێ شـێخ عەبدولفەتتاح بـە فەرمانی مەولانا نەبووبێ بە جێگەداری ، بـەڵکو بە فەرمانی شێخ عەبدوڵلای هەراتی بووبێ بە وەصی و لە تەکیەی مەولانادا دانیشتبێ .

بیستوچوار ڕۆژ گرفتاری تاعوون ئەبێ و کۆچی دوایی ئەکا و لە پشتی قەبری مەولاناوە دەفن ئەکرێ •

شێخ ئیسماعیل کە نەخۆش ئەکەوێ زوو نامە ئەنووسێ بەدوای شێخ عەبدوڵڵای هەراتیدا کە لەوکاتەدا لە سولەیمانی بووە بۆئەوەی بێت بۆ شام و تەکیەکە وەربگرێ ، ئەویش پاش وەرگرتنی نامەکە دەستبەجێ دێت بۆ شام و لە تەکیە دائەنیشێ و دەستئەکا بە ڕێپیشاندانی موسوڵمانان و خزمەتی خێزانی مەولانا •

شێخ عەبدوڵڵاش ماوەیەك لە تەکیەدا خەریکی ئیرشاد ئەبێ ، پاشان وەفاتئەکا • ئەمیش لەسەر وەصیەتی مەولانا [1] لە نەخۆشیی وەفاتیا هەموو کاروبار ئەسپێرێ بە شێخ عەبدولفەتتاحی عەقرەیی • شێخ عەبدوڵڵا لە ١٢٤٥ی هیجرەتدا کۆچی دواییی کردووە و لە بەرابەری قەبری شێخ ئیسماعیلەوە لە ( قاسیوون ) لە شام نێژراوە •

شێخ عەبدولفەتتاحیش زۆر بە دڵسۆزی‌یەوە دەستئەکا بە ئیرشاد و خزمەتکردنی موسوڵمانان و سەرپەرشتیکردنی کاروباری ماڵ و منداڵی مەولانا • تا لە ساڵی ١٢٥٩ی هیجرەتدا ، لە سەردەمی سوڵتان عەبدولمەجیدی عوسمانیدا ، ڕێوشوێنی کاری ئیرشاد و دەرسوتنەوەی عولوومی دینی ئەگۆڕێ و فەرمانی سوڵتانی دەرئەچێ کە شێخ مەحموود صاحێب بێ بە مورشیدی تەکیەی خالیدییە لە شام و ئەو جێگەکەی شێخ عەبدولفەتتاح ئەگرێتەوە • شێخ عەبدولفەتتاحیش پاش شام دێتە بەغدا و لە تەکیەی خالیدییەی بەغدا دەستئەکا بە ئیرشاد و پاشان لە ١٢٨٣ی هیجرەتدا لە

---

(١) ئەمە لەسەر بناغەی ئەوەیە کە ئیبراهیم فەصیح نووسیویە کە مەولانا لە وەصیەتەکەیدا شێخ عەبدولفەتتاحیشی کردبێ بە وەصی ، ئەگینا ئەبێ هەر لەبەر سوودی گشتیی موسوڵمانان دانرابێ .

ئەستەموول کۆچی دوایی ئەکا و لە گۆڕستانی ( ئەسکۆدار ) ئەنێژرێ •

شێخ مەحموود صاحێبیش لە مانگی ڕەجەبی ١٢٨٣دا لە شام کۆچی دوایی کردووە • سەید ئیسماعیلی غەززەییش لـە ١٢٤٧دا کۆچی دوایی کردووە و لە ( قاسیوون ) نێژراوە •

## باسی کەس‌وکار و ژن و منداڵی مەولانا

مەولانا چەند ژنێکی هێناوە • یەکەم : خزمی خۆی و کچی یووسف ئاغای مکایەڵی بووە ، پاش وەفاتی مەولانا بـە ماوەیەك کۆچی دوایی کردووە • دووهەم : ژنێکی عەرەبی بەغدایی بووە • ئەم ژنەی کاتێ هێناوە کە لە هیندستانەوە گەڕاوەتەوە بۆ سولەیمانی و پاشان لەوێوە چووە بـۆ بـەغدا و پێنج مانگ لە مزگەوتی حەزرەتی غەوث ماوەتەوە • سـێهەم : ژنێکی عەرەبی خەڵکی غەززەی فەلەستین و خوشکی سـەید ئیسـماعیلی غەززی بووە کە یەکێك بووە لە خەلیفەکانی خۆی •

ئەوەی من بیزانـم ئەوەتـە مەولانـا تا سەفـەری یەکەمیشـی لـە سولەیمانی‌یەوە بۆ بەغدا بە ماڵەوە ، دایکیشی لە ژیانا بووە و ، دوو برای بووە گەورەکەیان ناوی حەمەخان (موحەممەد خان)بووە و بچووکەکەیان ناوی (مەحموود) بووە کە مەشهوورە بە (مەحموود صاحێب) [1]• ئەم برا بچووکەیان تەریقەتی لەسەر دەستی مەولانادا وەرگرتـووە و سـولووکی لا کردووە و بووە بە خەلیفەی و یەکێکیش بووە لە خەلیفە بەهرەدارەکانی• مەولانا هەروا خوشکیشی بووە •

مەولانا لە ژنی یەکەمی کە کچی یووسف ئاغا بووە چوار کوڕی بووە

(١) ڕیچ باسی برایەکی‌کەشی ئەکا کە ناوی (یۆسف بەگ) بووە و فەرمانڕەوای ( پژدەر ) بووە و پاش کۆچی‌مەولانا پەنای بردووەتە بەر عەباس میرزا و گوایە عەباس میرزا کردوویە بە فەرمانڕەوای ( سەردەشت ) • [ ڕیچ ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٢٢٨ ] •

( عەبدولڕەحمان ) و (بەهائوددین) و (شەهابوددین) و (نەجموددین) • لە خوشکەکەی سەیید ئیسماعیلی غەززییش کچێکی بووە کە ساڵێك پێش وەفاتی مەولانا لە شام لەدایكبووە •

کوڕەکانیشی ، شەهابوددینیان کاتێ کە مەولانا لە ١٢٣٨دا کۆچئەکا بۆ شام ، لە ڕێگەدا لە شاری ئۆرفە لە ماڵی یەکێك لە خەلیفەکانی میوان ئەبن ، نەخۆش ئەکەوێ و وەفات ئەکا • مەولانا خۆی کە ئەگاتە شام باسی مەرگی ئەم کوڕەی بۆ خەلیفەکانی ئەکا و ، ئەو خەلیفەیەشی کە خەڵکی ئۆرفە بووە و مەولانا و هاوڕێکانی لەکاتی مردنی کوڕەکەیدا میوانی ماڵی ئەوان بوون ، لەوکاتەدا لە خزمەتی مەولانادا بووە لە شام • عەبدولڕەحمانیش لە تەمەنی شەش ساڵی و بەهائوددینیش لە تەمەنی پێنج ساڵیدا لە شام لە مانگی شەووالدا بەر لە باوکیان هەر بەو تاعوونە کە باوکیان وەفاتی پێ کردووە ، کۆچی دوایییان کردووە و لە گۆڕستانی (قاسیوون) نێژراون •

نەجمەددین دوا منداڵی مەولانایە • کە مەولانا وەفاتئەکا حەرەمی یەکەمی دووگیان ئەبێ • پاش وەفاتی مەولانا بە چەند مانگێك ئەم حەرەمەی نیازی سەفەری سولەیمانی ئەکا (٢) و شێخ ئەحمەدی خەطیبی هەولێری لەگەڵی ئەڕوا • حەرەمی مەولانا لە ڕێگادا منداڵەکەی لێ ئەبێتەوە ، کوڕ ئەبێ ناوی ئەنێن نەجمەددین • کە شێخ مەحموود صاحێب لە سولەیمانی خەبەری هاتنی حەرەمی مەولانا ئەبیسێ بە پێشوازیەوە ئەچێ و بەحورمەت

---

(٢) نەمدیوە کەس باسی خۆی ئەم سەفەرەی ئەم حەرەمەی مەولانای نووسیبێ . بەڵام بە بیری خۆم وائەزانم ئەم حەرەمەی مەولانا بۆیە ویستوویەتی بگەڕێتەوە چونکە زۆر دڵتەنگ بووە و ویستوویەتی کەمێك لەو پەرێشانییە دەرچێ و ، لەوانەشە ترسابێ ئەویش تاعوون بیگرێتەوە و سکەکەیشی بفەوتێ ، هەروەها بۆئەوە شتێکی لەو موڵك و ماڵەی مەولانا دەسگیر بێ کە بە وەصیەتی مەولانا خۆی کەوتبوە دەستی شێخ مەحموود صاحێب لە سولەیمانی .

لەگەڵ هاوڕێکانیا ئەبیاتە سولەیمانی . هەرچی موڵك و ماڵێکی مەولاناش بووە کە پێی بەخشیبوو نەذری ئەکا لە نەجمەددینی کوڕی مەولانا و پاش ماوەیەك لەگەڵ شێخ ئەحمەددا حەواڵەی شامیان ئەکاتەوە .

کە نەجمەددین ئەبێ بە دوو ساڵان دایکی سەفەرێکی بەغدا ئەکا و لەگەڵ خۆیی ئەبا . لەمسەفەرەدا شێخ عەبدوڵلای هەراتیشیان لەگەڵ بووە . پاش ماوەیەك لە بەغداشەوە ئەچن بۆ هەولێر و لە هەولێرەوە ئەگەڕێنەوە بۆ شام .

نەجمەددین لەسەر دەستی شێخ عەبدولفەتتاح و شێخ مەحموود صاحێبدا پێئەگا و [٣] تەریقەت وەرئەگرێ و پاشان ژن دێنێ و نەوەی لێ ئەکەوێتەوە و کوڕێکی کە ناوی شێخ موحەممەد بووە پاش خۆی بووە بە شێخی ئیرشاد [٤] . شێخ نەجمەددین لە ١٢٧٠دا لە شام کۆچی دوایی کردووە .

## باسی ئەوانەی مەولانایان لاواندووەتەوە پاش وەفاتکردنی

کۆچی دوایی مەولانا وەك کۆستکەوتنێکی ئێجگار گران بووە

(٣) ئیبراهیم فەصیح حەیدەری ئەڵێ نەجمەددین کە گەورە بووە سەفەرێکی بەغدای کردووە و لەو سەفەرەیدا میوانی ماڵی حەیدەرییەکان بووە . لەکاتی ئەم سەفەرەیدا شێخ عوثمان سیراجوددینیش لە هەورامانەوە هاتووە بۆ بەغدا بۆ سەرلێدانی و بەجێهێنانی حەققی وەفا بەرابەر بە مەولانای مورشیدی. ئیبراهیم فەصیح ئەگێڕێتەوە کە خۆیشی ئەوجارە شێخی سیراجوددینی دیوە و شێخ دوعای خێری بۆ کردووە .

(٤) شێخ موحەممەد جەمیل شەطلی لە (روض البشر)ەکەیدا ئەڵێ : ئێستا کە ١٣٢٤ی هیجرییە سێ تاقمی نەقشبەندی لە دیمەشق هەن ، تاقمی شێخ موحەممەد ئەفەندی و تاقمی ئەسعەد ئەفەندیی کوڕی شێخ مەحموود صاحێب و تاقمی ئەولادی شێخ موحەممەدی خانی، کە ئیجازەی ئیرشادیان لە شێخ عەبدوڵلای هەراتی وەرگرتووە .

لای مرید و مەنسووب و خەلیفەکانی و لای کۆمەڵانی موسولمانانیش لە هەرلایەك ناوبانگی ئەوی پێ گەیشتبێ • زۆریان بەتەمابوون لەسەر دەستی ئەودا چ لە مەیدانی خوێندنی عولوومی دینی و چ لە مەیدانی وەرگرتنی طەریقەت و سولووكکردن و تەصەووفدا بە پایەی بڵند بگەن • بۆیە کۆچی دواییی مەولانا زیانێکی گەورە بووە لە هەموو ئەوانە کەوتووە •

کە مەولانا وەفات ئەکا هەواڵی وەفات کردنی بە هەموو ولاتانی ئیسلامدا لە عەرەبستانەوە بیگرە تا ئەگاتە تورکیا و کوردستان و هیندستان بڵاوئەبێتەوە و ، لە هەموولایەك مەجلیسی تەعزیەی بۆ دائەنێن و مەلایانی گەورە لە هەموو لایەك بە کۆمەڵ نوێژی مردووی نادیار ( الصلوة علی الغائب)ی لەسەر ئەکەن • زۆریتریشیان مەرثییە و لاواندنەوەی جوانی بە شیعر بۆ ئەڵێن •

یەکێ لەمانە شێخ موحەممەد ئەمینی ئیبنوعابیدینە کە قەسیدەیەکی ناسکی لە لاواندنەوەیدا وتووە سەرەتاکەی بەمجۆرە دەست پێئەکات :

**أي ركنٍ منَ الشريعةِ مالا**
**فرأيناهُ قد أمالَ الجبالا**

**قد رُزِئنا بأوحدِ العصرِ علماً**
**وبهاءً وبهجةً وكمالا**

شێخ داوودی بەغدایی ئەم قەسیدەیەی تەشطیر کردووە ، واتە لەنێوان هەردوو نیوە بەیتێکیدا بەیتێکی داناوە و لە پێینی نامیلکەی (سَلُّ الحسامِ الهندي ، لنصرةِ مولانا خالدٍ النقشبندي )دا چاپکراوە •

یەکێکیتریان سەیید جوادی سیاهپۆشە کە بە قەسیدەیەکی حەفتا و شەش بەیتی لاواندوویەتیەوە ، ئەمە سەرەتاکەیەتی :

**خدينَ الهوَى خفَّ الخليطُ المُعاضِدُ**
**وأطلالُ احبابٍ هوَيْتَ هوامِدُ**

زانا و تەفسیرنووسی گەورە سەیید مەحموودی ئالووسی شەرحێکی دوور و درێژی لە ٢٦٤ لاپەڕەدا لەسەر ئەم قەسیدەیە نووسیوە لە سەرەتای موحەڕڕەمی ١٢٤٥ی هیجرەتدا تەواوی کردووە [1] •

یەکێکی تریشیان ئەدیبی مەشهوور عەبدوللەطیفی ئیبنولچادرچی‌یە ، قەسیدەیەکی لەسەر زەویی قەسیدەکەی سیاھپۆش و لە هەمان بەحر بۆ لاواندنەوەی داناوە ، ئەوەندە بەرزە ئالووسی لە ( الفیض الوارد)ەکەیدا ئەڵێ چەند پلە لە قەسیدەکەی سیاھپۆش جوانترە ، بەڵام قەسیدەکەی سیاھپۆش بڵاو بووەتەوە و هینەکەی ئەم ون بووە •

یەکێکی تریش لەوانەی مەولانایان لاواندووەتەوە شێخ ئیسماعیلی هەنارانی‌یە کە پاش خۆی بوو بە جێ‌نشینی • ئەمیش قەسیدەیەکی بیست و حەوت بەیتی بۆ وتووە ئەمە سەرەتاکەیەتی :

**ما للجبالِ الراسیاتِ تمیلُ**
**ما للبدورِ یُری بهنَّ أفولُ**

**ما للظلامِ یَجُرُّ ذیلَ ردائهِ**
**فوقَ الضیاءِ فلم ینَلْهُ مقیلُ**

## ڕشتەی ئیجازەی مەلایەتیی مەولانا

ڕشتەی ئیجازەی مەلایەتیی مەولانا چەند لقی هەیە، کە زوربەیان بەسراون بە بنەماڵەی حەیدەری‌یەوە • مەولانا خوێندنی لای شێخ موحەممەد قەسیمی مەردۆخی تەواو کردووە و ئیجازەی لا وەرگرتووە ، بەڵام هەروەها بە ئوسووڵی فەقێ چاکەکانی کوردستان و بە هیوای بەرەکەت و پیرۆزی ، ئیجازەی لای مەلا موحەممەدی ئیبنو ئادەم و مەلا صاڵحی تەڕەماری و مەلا

---

(١) ئەم کتێبە لە ساڵی ١٢٧٨ی هیجرەت ، ڕێکەوتی ١٨٦١ی میلادیدا ، لە چاپخانەی ( کەستەلی‌یە ) لەچاپدراوە .

عەبدولڕەحیمی زیاری و سەیید عەبدولڕەحیمی بەرزنجی و سەیید عەبدولکەریمی بەرزنجیی برای و شێخ عەبدوڵڵای خەرپانیش وەرگرتووە.

هەرچی ڕشتەی ئیجازەی شێخ موحەممەد قەسیمە ، ئەوە بەمجۆرەیە :

شێخ موحەممەد قەسیم ئیجازەی مەلایەتیی لای مەلا عەبدولقادری گۆرانی وەرگرتووە ، ئەمیش لای شێخ وەسیمی گەورە کە مامی باوکی شێخ موحەممەد قەسیم بووە . ئەمیش لای حاجی مەلا زەکەریای گۆرانی. ئەمیش لای شێخ موحەممەدی مەدەنی ، ئەمیش لای شێخ ئیبنوحەجەری هەیتەمی ( خاوەنی توحفەی بەناوبانگ لە شەرعدا ) . ئەمیش لای ئیمام شێخ زەکەریای ئەنصاری، ئەمیش لای شێخ عەلی ئیبنوحەجەری عەسقەلانی، ئەمیش لای ئیبنو عەططار . ئەمیش لای ئیمام یەحیای نەوەوی ، ئەمیش لای ڕەسلانی ئیردەملی . ئەمیش لای خاوەنی شامیلی بچووك . ئەمیش لای خاوەنی حاوی . ئەمیش لای ئەبولقاسیمی ڕافیعی ، ئەمیش لای ئەبولفەضل شێخ موحەممەدی کوڕی یەحیا ، ئەمیش لای ئیمامی غەزالی . ئەمیش لای ئیمامولحەرەمەین ، ئەمیش لای موحەممەدی جووەینیی باوکی ، ئەمیش لای قەففالی مەروزی ، ئەمیش لای ئیبنوسورەیج . ئەمیش لای عەلیی ئەنماطی . ئەمیش لای ئیبراهیمی مەزەنی ، ئەمیش لای ئیمام موحەممەدی کوڕی ئیدریسی شافیعی . ئەمیش لای موسلیمی کوڕی خالیدی زەنگی ، ئەمیش لای عەبدولمەلیکی کوڕی عەبدولعەزیز ، ئەمیش لای عەطائی کوڕی ڕەباح ، ئەمیش لای عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ڕەحمەتی خوا لە هەموانیان بێ . ئەمیش لای حەزرەتی پێغەمبەر دروودی خوای لێ بێ ، ئەمیش لە ڕێگای حەزرەتی جوبرەئیلەوە لە خواوەندی گەورەو توانای وەرگرتووە .

ڕشتەکانی تری ئیجازەی مەولانا هەموو ئەچنەوە سەر حەیدەرییەکان. وا بەجیا تا ئەگەنەوە سەر حەیدەرییەکان یەکەیەکەیان باسئەکەین . لە

حەیدەری یەکانیشەوە تا ئەوپەڕ هەموویان بە یەك زنجیرە ئەگێڕێنەوە :

ڕشتەی ئیجازەی مەلا موحەممەدی ئیبنو ئادەم بەمجۆرەیە : مەلا عەبدوڵڵای بایەزیدی ، صیبغەتوڵڵا ئەفەندیی حەیدەری [1] • ڕشتەی ئیجازەی مەلا صاڵحی تەڕەماریش بەمجۆرەیە : سەیید صاڵحی حەیدەری ، سەیید ئیسماعیلی حەیدەری ، صیبغەتوڵڵا ئەفەندیی حەیدەری • ڕشتەی ئیجازەی مەلا عەبدولڕەحیمی زیاریش بەمجۆرەیە : مەلا مصطەفای زیاری، سەیید صیبغەتوڵڵا ئەفەندیی حەیدەری • ڕشتەی ئیجازەی سەیید عەبدولکەریم و سەیید عەبدولڕەحیمی بەرزنجی و شێخ عەبدوڵڵای خەرپانی‌یش بەمجۆرەیە : سەیید موحەممەدی کوڕی سەیید خضری حەیدەری کە مەشهوور بووە بە ( ئەخرەس ) ، سەیید صیبغەتوڵڵا ئەفەندیی حەیدەری •

سەیید صیبغەتوڵڵا ئەفەندییش لەگەڵ سەیید ئیسماعیلی حەیدەریی برای ئیجازەیان لای باوکیان وەرگرتووە کە سەیید ئیبراهیمی حەیدەری‌یە[2] • ئەمیش ئیجازەی لای سەیید حەیدەری حەیدەریی باوکی وەرگرتووە، ئەمیش لای سەیید ئەحمەدی حەیدەریی باوکی[3] ، ئەمیش لای سەیید حەیدەری حەیدەریی باوکی، ئەمیش لای سەیید موحەممەدی حەیدەریی باوکی ، ئەمیش لای سەیید حەیدەر پیرووددینی حەیدەریی باوکی ، ئەمیش لای سەیید بورهانوددین ئیبراهیمی حەیدەریی باوکی ، ئەمیش لای خواجە عەلائوددینی حەیدەریی باوکی ، ئەمیش لای سەیید صەدرووددینی حەیدەریی باوکی ،

---

(١) صیبغەتوڵڵا ئەفەندی حاشیەیەکی لەسەر تەفسیری بەیضاوی نووسیوە.

(٢) سەیید ئیبراهیمی حەیدەری تەفسیرێکی قورئانی نووسیوە بە زمانی ئەهلی شەرع و ئەهلی تەصەووفەوە .

(٣) ئەم ذاتە کتێبێکی هەیە بە ناوی (موحاکەمات) لەسەر شەرحی جەلالی دەووانی لەسەر عەقایدی عەضودییە لە عیلمی کەلامدا .

ئەمیش لای سەیید شـێخ صەفیودین ئەبولفەتح ئیسـحاقی ئەردەبیلیی باوکی ، ئەمیش لای سەیید شێخ ئەمینوددین جوبرائیلی باوکی ، ئەمیش لای سەیید شێخ صاڵحی باوکی ، ئەمیش لای سەیید شێخ قوطبوددینی باوکی ، ئەمیش لای سەیید صەلاحوددین ڕەشیدی باوکی ، ئەمیش لای سەیید شێخ موحەممەد حافظی باوکی ، ئەمیش لای سەیید عیوەضی باوکی ، ئەمیش لای فەیرۆز شاهی خوارەزمیی باوکی ، ئەمیش لای سەیید موحەممەد شـاهی باوکی ، ئەمیش لای سەیید شەرەف شاهی باوکی ، ئەمیش لای سەیید شێخ موحەممەدی باوکی ، ئەمیش لای شێخ حەسەنی باوکی ، ئەمیش لای سەیید شێخ موحەممەدی باوکی ، ئەمیش لای سەیید ئیبراهیمی ئەدهەمی باوکی ، ئەمیش لای شێخ سـەیید جەعفەری باوکی ، ئەمیش لای شـێخ سـەیید موحەممەدی باوکی، ئەمیش لای شێخ سەیید ئیسماعیلی باوکی ، ئەمیش لای سەیید شێخ موحەممەدی باوکی، ئەمیش لای شێخ سەیید ئەحمەدی ئەعرابیی باوکی ، ئەمیش لای ئیمام ئەبوو موحەممەدولقاسمی باوکی ، ئەمیش لای ئیمام ئەبولقاسم حەمزەی باوکی ، ئەمیش لای ئیمام مووسای کاظمی باوکی، ئەمیش لای ئیمـام جـەعفەری صـادقی باوکی ، ئەمیـش لای ئیمـام موحەممەدولباقری باوکی ، ئەمیش لای ئیمام عەلی زەینولعابیدینی باوکی، ئەمیش لای حەزرەتی حوسەینی باوکی ، ئەمیش لای حەزرەتی عەلیی باوکی، ئەمیش لای حەزرەتی پێغـەمبەر (د) و ، ئەمیش لـە ڕێـگای حـەزرەتی جوبرەئیلەوە لە خواوەندی گەورە و توانای وەرگرتووە •

## باسی دەرسوتنەوەی مەولانا

وەك پێشان وتمان مەولانا بە زیرەکییەکی زۆری خۆی و بە ڕەنجو تەقەلای فەقێیەکی بەڕاسـتی حەز لە خوێندن کردوو ، لـە خزمەتی مەلا گەورەکانی کوردسـتاندا خوێندوویەتیو لـە هەموو ئـەو عیلمە عەقڵیو

نەقڵی‌یانەدا کە خوێندنیان لەو سەردەمەدا باو بووە ، بووە بە سەرامەد و ، سەرەنجام لای شێخ موحەممەد قەسیمی مەردۆخەیی ئیجازەی تەدریسی وەرگرتووە .

ئوسووڵ وایە کە فەقێ ئیجازە وەرئەگرێ پەیمان و گفت ئەدا بە ماموستاکەی کەوا بە ڕاستی و ڕێك و ڕەوانی لەسەر ڕێ و شوێنی شەریعەت بجووڵێتەوە و دەرس بە فەقێ بڵێتەوە و خزمەتی عیلم و دین بکا . مەولانایش بەپێی ئەم گفت و پەیمانە دەستی کردووە بە دەرس وتنەوە و قسەی خۆی بردووەتە سەر .

مەولانا لە سولەیمانی لەپێشاندا ، وەك باسمان کرد ، لە مزگەوتی سەیید عەبدولکەریمی بەرزنجەیی دانیشتووە و دەستی کردووە بە دەرس‌وتنەوە و لە هەموولایەکەوە فەقێی زیرەك و تێگەیشتووی هاتوونەتە لا . پاش سەفەری هیندستان و گەڕانەوەی لە هیندستانیش لە شوێنی پێشووی و لە خانەقا دەرسی وتوەتەوە ، بەڵام ئەوەندەی جاران نەپەرژاوەتە سەر ئەم بابەتە چونکە مەسەلەی ئیرشادی طەریقەت بەشێکی زۆری وەختی داگرتووە . لەگەڵ ئەوەشدا لەلاوە دەرسی بە مرید و مەنسووبە خوێندەوارەکانی هەر وتووە . بۆ نموونە شێخ ئیسماعیلی هەنارانی کە خەلیفەی بووە و پاش خۆی جێی گرتووەتەوە و مەلایەکی پایەبڵندیش بووە ، پازدە ساڵ لەگەڵ مەولانا بووە لەم ماوەیەدا سوودی زۆری لە مەیدانی زانستیشدا لێ وەرگرتووە .

شێخ هیدایەتوڵلای هەولێری کە تەریقەتی لەسەر دەستی مەولانادا وەرگرتووە ، فەقێ بووە . لەگەڵ ئەوەشدا سولووکی تەریقەتی تەواو کردووە و ئیجازەی خەلافەتی موطڵەقەی لێ وەرگرتووە . جارێکیان مەولانا پێی‌فەرمووە : هیدایەتوڵلا ! سەردەمێکی‌وا دێ بەسەرتا ئەگەر دەرسی عولوومی عەقڵی و نەقڵی نەڵێیتەوە لە وڵاتی خۆت دەرت‌ئەکەن و ،

فەرمانی‌داوەتێ کە لە هەر کتێبێ هەندێکی لە سەرەتاکەیەوە بخوێنێ • شێخ هیدایەتوڵلا بەم‌جۆرە لە خزمەتی مەولانا خۆیدا دەست‌ئەکا بە خوێندن و پاشان ئیجازەی تەدریسیشی لا وەرئەگرێ • پاش وەفاتی مەولانا بە ماوەیەك میر موحەممەد بەگی ڕەواندز هەولێر ئەگرێ و ، لەبەرئەوە کە زۆر ئارەزووی لە خوێندن و خوێندەواری بووە فەرمانی ئەدا هەر مەلایەك لە مزگەوتێ یا لە تەکیەیەکدا بێ ، دەرس بڵێتەوە بە فەقێ ئەگینا ئەبێ ولات بەجێ‌بێڵێ • بەپێی ئەم فەرمانە شێخ هیدایەتوڵلایش دەست‌ئەکا بە تەدریس لە هەموو عیلمەکانی مەلایەتیدا بە جۆرێ کە مەلاکانی هەولێر سەرسام ئەبن لە پایەی زانستی و لەو تەحقیق و تەدقیقەی کە لە دەرسدا ئەیکا • میر موحەممەد ئەمە ئەبیستێتەوە و حالی ئەبێ کە ئەمە کەرامەتی ئەولیایە ، داوای لێ‌بووردنی لێ‌ئەکا بەرابەر بە قوصووری • بەڵام شێخ هیدایەتوڵلا هەر بەردەوام ئەبێ لەسەر دەرس‌وتنەوەی خۆی شان‌بەشانی ئیرشادکردنی خەڵك ، تا پاشان ئەگوێزێتەوە بۆ بەغدا و لەوێش هەر بەردەوام ئەبێ تا لە بەغدا کۆچی دوایی ئەکا و لە قەبرستانی ئیمامی ئەعظەم لەتەنیشت قەبری مەلا یەحیای مزووری و لەنزیك قەبری شێخ عەبدولڕەحمان ئەبولوەفای کوڕی شێخ عوثمان سیراجوددینی تەوێڵەوە کە پێشتر وەفاتیان کردووە ، ئەسپێررێ بە خاك •

شێخ شەهابوددینی ئالووسی خاوەنی تەفسیری (روح المعانی) لە کتێبی (أصفی الموارد)دا نووسیویە ئەڵێ : «ئەوەی ئێمە دیومانە لە ئەحوالی حەزرەتی مەولانا لەبارەی دەرس‌وتنەوەوە ئەوەیە کە خەریکی دەرس وتنەوەی‌کتێبی فیقه ئەبوو وەکو (نهایە)ی ڕەمەلی لە مەذهەبی شافیعیدا ، یا وەکو شەرحی عەقایدی نەسەفی و حاشیەی خەیاڵی و حاشیەی عەبدولحەکیم لە ئوصوولی دیندا و نزیکەی دە جوزء تەعلیقاتی لەسەر

عەبدولحەکیم هەبوو • هەروا ئەمان‌بیست کەوا نەهیی لە موتالاّی هەندێ کتێبی موتەصەوویفە ئەکرد وەکوو (الفتوحات المكية) و (فصوص الحکم)ی ئیبنو عەرەبی و ئەم جۆرە کتێبانە • لە هەمان کاتیشـدا ئەگەر لەبـارەی هەندێ تەدقیقاتی موتەصەوویفەوە پرسیاری لێ بکرایە ، لە وەڵامدا وەکو دەریا شەپۆلی ئەدا و گوێ‌گرانی بە مەعنای بەرز و ناسك تەنویر ئـەکرد و دڵیانی ڕوون ئەکردەوە •

هەروەها شێخ شەهـابوددین ئەفـەرموێت لەکاتێـکا حاشـیەکانی عەبدولحەکیمی سیالەکوتیم بەسەر خەیاڵی‌یەوە ئەخوێند ، نەقڵێکم دی لە مـوحەققیقی دەووانی‌یەوە لە شەرحی عەقایدی عەضودییە کە ئەفەرموێت بزانە مەسئەلەی زیادەی صیفاتی خوای تەعالا لەسەر ذات و نازیادی‌یان لەو ئوسوولاّنە نی‌یە کە کافرکردنی (احد الطرفين)ی پێوە ببەسترێ • لە هەندێ پیاوانی خوایشم بیستووە کەوا ئەم جۆرە باسانە بە کەشف نەبێ دەرناکەون و خراپەیـەك لەوەدا نی‌یە کە ئینسان باوەڕی بە هەرلایـەکی نەفی یا ئیسبات هەبێ لەم مەسئەلەیەدا • لەم مولاحەظەیەوە ئارەزووم هەبوو ئەم مەسئەلەیە لێك بدەمەوە و ویستم لە مەولانا بپرسم تا ڕاستیی مەسئەلەکەم پیشان‌بدا ، بەڵام شەرمم ئەکرد لەوە کە بچمە لای و لە حوزووریدا قسە بکەم • بـە چەند شیعرێك پرسیارم لێ‌کرد و ناردمە خزمەتی • کە شیعرەکانی خوێندەوە ناردی بەدوامدا و فەرمووی نزیك بکەومەوە لێی • ئەنجا پێی‌فەرمووم ڕەوا نی‌یە ئینسان لە وەرگرتنی زانست و لە مەیدانی فێربووندا شەرم‌بکا • منیش کتێبەکەم کردەوە و عیبارەتەکەم بۆ خوێندەوە • مەولانا سەری نزیك‌کردەوە بۆ سەر کتێبەکەم و فەرمووی ئەوەی کە ڕاستە و پشـتی پێ‌ئەبەسـترێ ئەوەتە کە بڵێین صیفات زیادن لە ذات و عەینی ذات نین و چەنـد بەڵـگەی عەقلیی‌وای بەیان‌کرد کە نەمبیستبوون و بە بیرمـدا نەهاتبـوون و ڕووی شوبهەی موعتەزیلەکانی ڕەد کردەوە تا ئەوەی حەق و ڕاستە بە سافی لـە

دڵمدا جێ‌گیر بوو • جا فەرمووی هیچــت لە شوبهــەی ئەوان لا مــاوە ؟ عەرزم‌کرد نەخەیر ، خوا بتهێڵێ و بە ژیــانت سوودمــەند و بە بەرەکــەتت نوورانیمان بکات • ئەمجار لە ڕووی تەواضوع و خــۆ بە کەم زانینــەوە فەرمووی گومان نەبەی من لە ڕووی کەشفەوە ئەم مەسەلەیەم زانــیوە ، نەخەیر لە کتێبی زانا موحەققیقەکانم وەرگرتووە ، منیش دەستم ماچ‌کرد و گەلێ دوعــای لەش ساغیم بۆ کرد • مەولانا لەم جۆرە تەحقیقاتەی ئەوەندە هەن ناژمێررێن •

مەولانا کە چوویشەتە شام گەلێ لە زاناکانی ئەوێ بە حەڵقە دەرسی نیهایەی ڕەمەلی‌یــان لا خوێــندووە لــەگەڵ لێکدانەوەیــەکی نــایابدا • لەوشوێنانەشدا کە لەنێوان ڕەمەلی و ئیبنو حەجەرو خەطیبدا خیلاف هەیە و قسەیان ناکەوێتەیەك ، مەولانا دەفعی خیلافــەکەی ئــەکردن و قسەکانیانی کۆئەکردەوە بە جۆرێ کە هەموان لایان پەسەند بوو •

بیستوومە مەولانا حەڵقەیەکی دەرس‌وتنەوەی صــەحیحی بوخــاریی شەریفی لە شام بووە گەلێ لە زانایانی شام لەو حەڵقەیەیدا حازر بوون • لەو سەردەمەدا زانایەك خەریکی شەرح‌کردنی بوخاری ئەبێ ، کە باسی ئــەم حەڵقەی دەرسی مەولانایە ئەبیســێ ، چەند ڕۆژێك دێت بۆ گوێ‌گرتن • ئیتر دەس لە شەرح کردنەکەی خۆی هەڵئــەگرێ و ئەبێ بــە گوێ‌گری هەمیشەی حەڵقەی دەرسەکەی مەولانا • یەکێ لە دۆستانی لێی‌ئەپرســێ بۆچی وازی لە شەرح‌کردنەکەی بوخاری هێناوە ؟ ئەویــش لە وەڵامــدا ئەڵێت پێویستە ئینســان ئینســافی بێ • ئــەوەی من لە شەرحــەکەمدا ئەینووسم لە هەندێ لە تەقریرەکانی مەولانادا هەیە ، ئەوی‌تری تەقریرەکانی هەمووی سوودی زیاتری ئەوتۆن لای غەیری مەولانا دەست‌ناکەون • بۆیە ئەگەر حازری دەرسەکەی ئەو نــەبم و گوێی بۆ ڕانــەگرم ، لە دەستــم دەرئەچێ و پێویستیشم پێ‌یەتی •

ئەمە شتێکی زۆر نایابە عالمێك لە کوردستانا پێگەیشتبێ و خوێندنی تەواوکردبێ ، ئەوەندە شارەزای عیلمی حەدیث بێ ، چونکە وتنەوەی حەدیث لە کوردستاندا باو نییە •

ئیبراهیم فەصیح حەیدەری لە (المجد التالد)دا لە باسی مەناقیبی مەولانادا نووسیویە ئەڵێ : زانای پایە بڵند شێخ عەلیی سووەیدی کە لە گەورەترینی حەدیث گێڕەوەکانی بەغدا بووە ، ڕۆژێکیان دێت بۆ خزمەتی مەولانا بۆ تاقیکردنەوەی لە عیلمی حەدیثدا • کە ئەگاتە بەرەوە موصافەحەی لەگەڵ ئەکا و هەر بە ڕاوەستانەوە حەدیثێك لە ئەحادیثی ئەووەلییە ئەخوێنێتەوە • لەکاتێکا کە هێشتا دەستیان لەناو دەستی یەکدا بووە • هەر لەوکاتەدا مەولانایش حەدیثێکی لەو چەشنە ئەخوێنێتەوە • کە دائەنیشن شێخ عەلی سووەیدی بە ژمارە سي حەدیث لە حەدیثەکانی شەش صەحیحەکە ئەخوێنێتەوە و ئیسنادەکانیان هەڵئەگێڕێتەوە ، یەعنی ئیسنادی حەدیثێ ئەدا بە حەدیثێکیتر و بەمجۆرە بەنیازی تاقیکردنەوە ، جا پاشئەوە تەواویان ئەکا • حەزرەتی مەولانا ئەو حەدیثانە هەریەکی بە عەینی ئیسنادی ڕاستی خۆیەوە ئەخوێنێتەوە ، جا شێخ عەلی ئەکەوێ بەسەر دەستی حەزرەتی مەولانادا و داوای لێبووردنی لێئەکا •

کە شێخ عەلیی سووەیدی لای مەولانا هەڵئەستێ و ئەڕوا ، ئەڵێ ئەم ذاتە لە ئەولیا گەورەکانی خوایە و عولوومی ظاهیر و باطینی پێکەوە لە خۆیدا کۆکردووەتەوە و وەك دەریای بێ لێوار وایە و ئێمەمانان لەچاو ئەودا وەك دڵۆپە ئاوێکین لە چاو دەریایەکدا و پێویستە هەمووومان هەوڵ بدەین بۆ سوود وەرگرتن لە عولوومی ڕەببانی و ئەنفاسی قودسیی ئەم پیاوە •

مەولانا بەدرێژاییی ماوەی خەریكبوونیشی بە ئیرشادەوە • دەرسی بە فەقێ هەر وتووەتەوە ، هەرچەند جاروبار دەرەتانی بۆ دەرس وتنەوەکە هەندێك کەم بووە • هەر بۆیەشە کە خەریکی عولوومی ظاهیر و باطین بووە

لای زانایان و خواپەرستان بە ( ذو الجناحین ) واتە (خاوەنی دوو باڵی ظاهیر و باطین ) ناوی دەرکردووە • بەڕاستی وەك چۆن جەنابی (جونەیدی بەغدایی ) بە (سید الطائفتین) واتە (گەورەی هەردوو هۆزەکە) نـاوی دەرکردووە ، چونکە شانبەشانی خەریكبوونی تەصەووف دەرسی فەقێکانیشی پشتگوێ نەخستووە ، مەولانایش لە سەردەمی خۆیدا (سـید الطائفتـین) بووە و جیهانی ئیسلامی بە نووری ظاهـیر و باطـین نـوورانی کردووە ، بـەڵام نوورانیکردنێکی دەوامدار ، چونکە لەوڕۆژەوە تائێستـا ئیرشـادکردنی موسوڵمانان لەناو مرید و مەنسووبەکانیدا بەردەوامـە و سـوودیان لـێ وەرئەگیرێ •

## ئەو کتێبانەی کە مەولانا دایناون

بەپێی ئەوەی لە هەندێ سەرچاوەی بـاوەڕپێکراوی وەك (الشیـخ معروف النودهی )یەکەی شێخ موحەممەدی خاڵدا نووسراوە ، مەولانـا گەلێ تەئلیفاتی هەیە کە ئەمە ناوەکانیانە لەگەڵ وردە باسێکیاندا :

(١) شەرحی لەسەر (اطباق الذهب)ی زەمەخشەری بە فارسی •

(٢) شەرحی لەسەر مەقاماتی حەریری ، بەڵام تەواوی نەکردووە [1] •

(٣) حاشیەی لەسەر عەبدولحەکیمی سەیالەکووتی کە مەشهوورە بـە ( تتمة ) ، چونکە حاشیەکەی عەبدولغەفووری لاری کە تـا ( اصـوات ) ڕۆیشتووە و بـەس ، عەبدولحەکیم بـۆی تەواوکردووە • ئەمـە لەپێش سەفەری هیندیدا بووە •

(٤) جالیة الاکدار ، فی تقلبات الامصار •

---

(١) لە کتێبخانەی شێخ موحەممەدی خاڵدا نوسخەیەکی دەسنووسی مەقامات هەیە مەولانا بە فارسی بە خەتی خۆی تەعلیقاتی لەسەر نووسیوە .

(٥) تەعلیقاتی مودەووەنەی لەسەر حاشیەی (خەیالی) لەسەر شەرحی عەقایدی نەسەفی و لەسەر عەبدولحەکیمی خەیالی لە عیلمی کەلامدا کە لە سالی ١٣٠٧ی هیجرەت ، ڕێکـەوتی ١٨٨٩ی میلادیـدا لە ئەستەمـوول چـاپکراوە •

(٦) العقد الجوهري ، في الفرق بين كسبي الماتريدى والاشعرى ، لـە عیلمی کەلامدا • شێخ عەبدولحەمیدی خەرپووتی شەرحی لەم ڕیسالەیـە کردووە و ناوی‌ناوە (السمط العبقرى ، في شرح العقد الجوهرى) • ئیبراهیم فەصیح حەیدەرییش شەرحی لەسەر کردووە •

(٧) کتێبە بچکۆلەیەك لە باسی عیباداتـدا . بۆ ئەو مریدانـەی کـە حەنەفی مەذهەب بوون و چوونەتە سەر مەذهەبی ئیمامی شافیعی خوایان لێ ڕازی بێ •

(٨) حاشیەی لەسەر (نهایە)ی ڕەمەلی لە فیقهی شافیعیدا ، تا باسـی نوێژی جومعەی لەسەر ڕۆیشتووە لە دوو بەرگدا •

(٩) شەرحی لەسەر عەقایدی عەضودییە لە عیلمی کەلامدا •

(١٠) حاشیەی مودەووەنەی لەسەر کتێبی (جمع الفوائد ، من جـامع الاصول و مجمع الزوائـد من كتب الحديـث ) کە موحەممـەدی کوڕی سولەیمانی مەغریبی حەدیثەکانی چوارده موسنەدی تیا کۆکردووەتەوە •

(١١) شەرحی لەسەر حەدیثی (ئیمان) بە زمانی فـارسی ، عەقـایدی ئیسلامی تیا کۆکردووەتەوە و ناوی ناوە (فرائد الفوائد) [٢] •

(١٢) جلاء الأكدار ، والسيف البتار بالصلوة على النبي المختار • لەم کتێبەدا نـاوی ئەصحابی غـەزای بەدری بەپێی حەرفـەکانی ئەلـفوبێ کۆکردووەتەوە •

---

(٢) دانەیەکی دەسنووسی ئەم کتێبە لە کتێبخانەی شێخ موحەممەدی خالدا هەیـە .

پێنجەم ــ شێخ موحەممەدی ئیمام • ئەم ذاتە لەپاش طەریقەت وەرگرتن و سولووك كردن و ڕیاضەت كێشانێكی زۆر گەیشتووەتە پایەی ئیرشاد ، جا مەولانا ئیجازەی ئیرشادی داوەتێ و كردوویە بە خەلیفەی خۆی و تا مەولانا لە تەكیەی خالیدییە بووە ، ئەم پێش نوێژیی بۆ كردووە و مەولانا تەرجیحی داوە بەسەر خەلیفەكانی تریدا بۆ پێش نوێژی• كە وەفاتیشی كردووە ، لە قەبرستانی كەرخدا نێژراوە لەپاڵ مەرقەدی ( سید الطائفتین ) شێخ جونەیدی بەغدادیدا •

شەشەم ــ مەلا ئەبووبكری بەغدایی • ئەم ذاتەیش پاش چوونە ڕیزی تەریقەت لە مەولانا جیانەبووەتەوە و بۆ كوێ چووبێ لەگەڵی بووە و ڕووت بووە لە هەموو پێوەندی‌یەكی دنیا و پاش وەفاتی شێخ موحەممەدی ئیمام بووە بە پێش نوێژی مەولانا • ئەڵێن قورئانی لەسەر شێوەی ئوبەیی كوڕی كەعب خوێندووە و ئەوەندە دەنگی خۆش بووە وتوویانە خوا كردوویە بە هاوبەشی حەزرەتی داوود لە دەنگ خۆشیدا • بە شەو و بە ڕۆژ خەریكی عیبادەت بووە و گەلێ ڕیاضەتی كێشاوە و جیهادی نەفسی كردووە • مەولانایش ئیجازەی خەلافەت و ئیرشادی داوەتێ • كە مەولانا لە بەغدا كۆچی كردووە بۆ شام ، ئەمیش لە خزمەتیا چووە و لە شام كۆچی دوایی كردووە و لە نزیكی مەولاناوە لەگەڵ شێخ ئیسماعیلی هەنارانی و شێخ عەبدوڵڵای هەراتیدا سپێرراوە بە خاك •

حەوتەم ــ سەیید ئیسماعیلی غەززەیی • ئەم ذاتە ، وەك لە كتێبی ( روض البشر في اعيان القرن الثالث عشر )دا نووسراوە بینا لەسەر تەرجەمە حاڵی كە سەیید صالح ئەفەندیی كوڕەزای نووسیویە كە موفتیی شافیعی‌یەكان بووە لە شام ، ئیسماعیلی كوڕی عەبدولغەنیی كوڕی موحەممەد شەریفە ، زانایەكی پایەبەرز و ئەدیبێكی بەدەسەڵات بووە ، لە

ساڵی ١٢٠٧ی هیجرەتدا لەدایك‌بووە و لای شێخ عەبدولڕەحمانی کەزبەری و شێخ حامیدی عەتتار و لای مەولانا و کەسانی‌تریش خوێندوویەتی •

ئەم ذاتە لەسەر دەستی مەولانادا تەریقەتی نەقشبەندیی وەرگرتووە و ئیجازەی خەلافەت و ئیرشادی پێدراوە و مەولانا خوشکی ئەمی خواستووە کە تەنیا کچێکی لێ بووە شووی کردووە بە شێخ موحەممەدی خانیی دیمەشقی کە ئەویش خەلیفەی مەولانا بووە •

ئەمە نموونەیەکی شیعری ئەم ذاتەیە لە تەعریف‌کردنی مەولانادا نووسیویە :

**يا حسنَ فوّارةٍ تُبدى لنا عجَباً**
**حكَت قَوامَ فتاةٍ صيغَ من بَرَدِ**
**ناشدتُها بالذى قد زانَ طلعتَها**
**و قد كسا جسمَها دِرعا من الزَّرَدِ**
**ما بالكِ تنهمى منكوسةً أبداً**
**لا ترفعىِ الرأسَ أو تُصغىِ الى احدِ**
**فأنشدَتْ بلسانِ الحال قائلةً**
**هذا خضوعى لذى العرفانِ والمَدَدِ**

هەروەها قەسیدەیەکیشی هەیە ناوی موجەددیدەکانی هەر دوازدە قەڕنەکەی ئیسلامی تێدا هۆنیوەتەوە و دوایی‌یانی بە مەولانا هێناوە . لەم قەسیدەیەدا ئەڵێ :

**وبعدَهم من قد رقى المراقِى**
**مُحدّثُ الشامِ كذا العراق**
**ومرشدُ الخلقِ لدين الحق**
**بالفيض والارشاد والترقى**
**أعنى ضياءَالدينِ وهو خالد**
**غوثُ الورى ابو البَهاءِ الماجد**
**بارِكْ لنا يا ربَّنا فى مُدَدِهِ**
**واقسِمْ لنا منْ نفحاتِ مَددِهِ**

ئەم ذاتە نامیلکەیەکی لەبارەی مەولاناوە نووسیوە ناوی ناوە (حصولُ الأنسِ ، في انتقالِ حضرةِ مولانا الی حظیرةِ القدسِ ) • ئەم ذاتە لە سەفەری حەجدا لەنێوان مەککە و مەدینەدا لە ١٢٤٧ی هیجرەتدا کۆچی دوایی کردووە •

هەشتەم ــ شێخ مەعرووفی تیکریتی • ئەم ذاتە تەریقەتی لەسەر دەستی مەولانا خۆیدا وەرگرتووە و ماوەیەکی زۆر خەریکی خواپەرستی و ڕیاضەت‌کێشان و موجاهەدەی نەفس بووە تا گەیشتووە بە پلەی مورشیدانی پایەبەرز و مەولانا کردوویە بە خەلیفەی خۆی و ئیجازەی ئیرشادی داوەتێ، بەڵام لەبەر خەریك بوونی بە تەجەللی‌یاتی خۆی و زۆریی جەذبە لێ‌هاتنیەوە کەمتر توانیویە خەریکی ئیرشادکردن بێ • لەناو مریدان و مەنسووبانی مەولانادا زۆر بەڕێز بووە •

نۆهەم ــ شێخ موحەممەد ناصیح کە یەکێ بووە لە گەورە گەورانی مەنسووبینی مەولانا • وەك پێشتریش باسمان‌کرد ، لە ( روض البشر )دا نووسراوە ئەم ذاتە وەصی بووە کە پاش سەیید ئیسماعیلی هەنارانی و شێخ عەبدوڵڵای هەراتی لە جێگای مەولانادا ئیرشاد بکا ، بەڵام ( المجد التالد ) ئەمەی باس نەکردووە • ئەم ذاتە پاش مەولانا بە ماوەیەکی کەم بە تاعوون کۆچی دوایی کردووە و لە نزیکی مەولانادا سپێرراوە بە خاك •

دەهەم ــ شێخ عەبدولقادری دیملانی • ئەم ذاتە لەگەڵ شێخ موحەممەد ناصیح پێکەوە سولووکیان کردووە لە خزمەتی مەولانادا و پێکەوەش ئیجازەی خەلافەتیان لا وەرگرتووە و ئەمانیش تا مردن هەر لێی جیانەبوونەتەوە و لە شامدا پێکەوە بە ئەمری مەولانا خەریکی پەروەردەکردنی خەڵك بوون •

یازدەهەم ــ شێخ مووسای بەندەنیجی (مەندەلاوی) • ئەم ذاتە پاش

سولووك كردن و ڕیاضەت كێشانێكی زۆر و هاوڕێیەتی‌یەكی دڵسۆزانەی مەولانا و مانەوەی ماوەیەكی درێژ لە خزمەتیا ئیجازەی خەلافەت و ئیرشادی لێ وەرگرتووە و دەستی كردووە بە ئیرشادی موسوڵمانان و بووە بە هۆی گەڕانەوەی زۆركەس لە خراپە و بیدعەت و سوودێكی زۆری بە موسوڵمانان گەیاندووە •

دوازدەهەم ــ شێخ عیسای بەندەنیجی • ئەم ذاتەش بەپێی ئەوەی لە كتێبی (الانوار القدسیە)دا نووسراوە خەلیفەی مەولانا بووە ، بەڵام ئیبراهیم فەصیح حەیدەری لە ڕیزی خەلیفەكانی مەولانادا نەیژماردووە • زانایــەكی بەرز و شاعیرێكی باش بووە • مامۆستای مەدرەســەی حــەزرەتی غەوث بووە • گەلێ لە مەلا گەورەكانی بەغدا وەك عەبدولسەلامی شــەوواف كە پاش ئەم بووە بە مامۆستا لە مەدرەسەی حــەزرەتی غــەوث ، لای ئــەم خوێندنیان تەواو كردووە • قــەبری ئەم ذاتــە لە بەغــدایە لە مــزگەوتی بەندەنیجی لە نزیك مزگەوتی حەزرەتی غەوثــەوە و هێشتــا نــەوەی لەو مزگەوتەدا ماون •

سیازدەهەم ــ شێخ موحەممەدی خانی • وەك لە ( روض البشر )دا لە ( الحدائق الوردیة في حقایق الاجلاء النقشبندیة ) گێڕراوەتەوە ، ئەم ذاتــە كوڕی عەبــدوڵڵای كوڕی موصــطەفای خانیی شافیعی‌یە • لــە ١٢١٣ی هیجرەتدا لە ( خان شەیخون ) لەنێوان ( حەما ) و (حەڵەب) لەدایكبووە • منداڵ بووە باوكی كۆچی دوایی كردووە و دایــكی بەخێو و پەردەردەی كردووە و ناویەتە بەر خوێندن • پاشان بردوویەتی بۆ ( حەما ) و لەوێ لای شێخ خالیدولسەیید و لای شێــخ عەبدولڕەحیمی بوســتانی خوێندوویە • بەشێكی علمی نەحوی لای شێخ حەمسوود زوهەیر خوێندووە ، جا تەریقەتی قادریی لەسەر دەستی شێخ موحەممەد سەعدی گەیلانیدا وەرگرتووە و لە مزگەوتی شێخ عەلوان لە حەما دەستی كردووە بە ئیرشاد و دەرس وتنەوە •

که مەولانا هاتووە بۆ شـام هاتوەتە خزمەتی و تەریقەتی لەسـەر دەستدا وەرگرتووە و دەستی کردووە بە سولووك کردن و ڕیاضەت کێشان •

لە ساڵی ١٢٤١ی هیجرەتدا بە فەرمانی مەولانا بە ماڵەوە لە (حەما)وە گوێزاویەتەوە بۆ دیمەشق و لە مزگەوتی ( عەدداس ) دانیشتووە و هەرچەند مەولانا دەرسی بە فەقێ وتبێتەوە ئەو بووە بە (موعید)ی دەرسەکانی ، تـا خەلیفەی مەولانا لە مزگەوتی (مرادیبە) لە (سویقە) کۆچی دوایی کردووە • پاش ئەوە مەولانا لەو مزگەوتەدا دایناوە و ئیجازەی خەلافەتی موطڵەقەی داوەتێ کە ئیرشاد بکا ، لەوێ لەسەر ئیرشاد ماوەتەوە تا شێخ عەبدوڵڵای هەراتی وەفـاتی کردووە ، جا لـە جێگەی ئەودا لەسـەر تەکیەی مەولانا دامەزراوە بە فەرمانی شێخ عەبدوڵڵای هەراتی •

ئەم ذاتە لەناو مرید و مەنسووبەکانا زۆر بەڕێز و حورمەت بووە و ، ئەمیش بەشێوەیەکی جوان و بەرز ئیرشادی موسوڵمانانی کردووە • لـە ١٢٤٥دا چووە بۆ حەج و لە ١٢٥٣دا کتێبی ( البهجة السنیة في آداب الطریقة الخالدیة )ی داناوە کە لە ١٣٣٠دا لە قاهیرە لەچاپدراوە • سێ جاری‌تریش هەروا چووەتەوە بۆ حەج ، جارێکیان لە ١٢٥٩دا و جارێکیان لە ١٢٦٠دا و جاری چوارەمیان لە ١٢٧٤دا لەگەڵ دوو کوڕی و گەلێ تەبەعەیدا • میرحەج لەو سەردەمەدا صەفوەت پاشای والیی دیمەشق بووە ، زۆر حورمەتی شێخ موحەممەدی گرتووە • شێخ موحەممەد لە ١٢٦٦یشدا زیارەتی قودسـی کردووە و لـە ١٢٧٠دا سـەفەری ئەستەموولی بووە • لەوێ زۆر ڕێزی لێ‌گیراوە • پاش ئەو سەفەرە گەڕاوەتەوە بۆ شـام و خەریکی ئیرشـاد و تەدریـس کردنی خـۆی بووە • گەلێ‌کەس لەسەر دەسـتی ئـەم ذاتەدا پێگەیشتوون و پەروەردە بوون و سـوودێکی زۆری بـە موسوڵمانان گەیاندووە •

ئەم ذاتە لە دوارۆژەکانی ژیانیدا سەفەرێکی ( حەما )ی کردووەتەوە و لەوێ نەخۆش کەوتووە و لە ڕۆژی دووشەممەی ١٩ی صەفەری ١٢٧٩ی هیجرەتدا کۆچی دوایی کردووە و تەرمەکەی هێنراوەتەوە بۆ شام و لە چیای قاسیوون لە نزیکی مەرقەدی مەولاناوە سپێرراوە بە خاك •

ئەم ذاتە چوار کوڕی لێ بەجێماوە ، شێخ موحەممەد کە زانایەکی گەورە و زاوای مەولانا بووە و پاش باوکی جێگەکەی ئەوی گرتووەتەوە و لە ١٣١٦دا کۆچی دوایی کردووە • ئەو سێ کوڕەکەشی شێخ ئەحمەد و شێخ مەحموود و شێخ عەبدوڵلا کە هەرسیانیان بەر لە ١٣٣٥ی هیجرەت کۆچی دوایی‌یان کردووە •

چواردەهەم ــ شێخ ئەحمەدی سەمین • ئەم ذاتە مامۆستای مەدرەسەی ئیمامی ئەعظەم بووە لە بەغدا •

پازدەهەم ــ شێخ عەبدوڵلای فەرد• ئەم ذاتە پاش وەرگرتنی ئیجازەی خەلافەت لە قودس دانیشتووە و ئیرشادی موسوڵمانانی کردووە •

شازدەهەم ــ شێخ موحەممەدی کوڕی سولەیمان • ئەم ذاتە خاوەنی کتێبی ( الحديقة الندية )یە •

حەڤدەهەم ــ شێخ موحەممەد صالح•ئەم ذاتە پێشەوای شافیعی‌یەکان بووە لە شاری مەککە •

هەژدەهەم ــ شێخ عەبدوڵلای ئەرزەنجانی‌یە • ئەم ذاتە ئینسانێك بووە بەجارێ دەستی لە دنیا داشتووە و وڵاتی خۆی بەجێ‌هێشتووە و لەپاڵ ماڵی خوادا لە مەککە دانیشتووە بۆ خواپەرستی • گەیشتووەتە خزمەتی مەولانا و ئیختیاری تەریقەتی نەقشبەندیی لەسەر دەستی ئەودا کردووە و لەسەر سولووك کردن و ڕیاضەت کێشان و جیهادی نەفس بەردەوام بووە تا ئیجازەی ئیرشادی موطڵەقی دراوەتێ و بووە بە خەلیفە • لە گەورە

گەورانی خەلیفەکانی مەولانا بووە و مەقامی ( صەحو ) و (بەقا)ی بووە • گەلێ لە پیاوی گەورە و زانایانی سەردەم تەریقەتیان لەسەر دەستیدا وەرگرتووە و بەهرەمەند بوون لای • مەولانا زۆری خۆش‌ویستووە ، تەنانەت لە یەکێ لە سەفەرەکانی حەجیدا پێی‌وتووە ئەم‌جارە لەبەر خاتری تۆ هاتووم بۆ مەککە ، عەبدوڵلا ! ئەویش لە خۆشی‌یاندا کەوتووە بەسەر دەست و پێی مەولانادا • لەنێوان ئەم ذاتە و سەیید عەبدولغەفووری مەشاهیدیدا گەلێ نامە و نامەکاری بووە کە پڕ بوون لە دۆستایەتی و مەحەببەت و گفتوگۆی ڕۆحی و باطینی ، وەك لەنێوان دوو قوتابیی قوتابخانەیەکدا •

نۆزدەهەم ــ شێخ موحەممەد عاشقی میسری • ئەم ذاتە لە شام بە خزمەتی مەولانا گەیشتووە و داخڵی تەریقەت بووە و سولووکی کردووە تا گەیشتووە بە پایە و مەولانا ئیجازەی خەلافەت و ئیرشادی داوەتێ • ئیبراهیم فەصیح حەیدەری ئەڵێ وەکو شێخ عەبدولفەتتاحی عەقرەیی خەبەری داومەتێ ئەم شێخ موحەممەد عاشقی میسری‌یە دوا خەلیفەی مەولانا بووە و ، کە لە ١٢٨٠ی هیجرەتدا لە سەفەری حەج گەڕامەوە و لە میسر لام‌دا بە خزمەتی گەیشتم • لەو سەردەمەدا لە خەلیفەکانی مەولانا خۆی تەنها ئەم ذاتەیان مابوو • ئەمە قسەی شێخ عەبدولفەتتاحی عەقرەیی‌یە ، بەڵام ئەو دیارە ئاگای لەوە نەبوە کە شێخ عوثمان سیراجوددین لە تەوێڵە تا ١٢٨٣ ژیاوە •

بیستەم ــ شێخ فەیضوڵلای ئەرزڕۆمی‌یە • ئەم ذاتە کە ناوبانگی مەولانای بیستووە هاتووە بۆ سولەیمانی و لەوێ بە خزمەتی مەولانا گەیشتووە و تەریقەتی لەسەر دەستیدا وەرگرتووە و خەریکی موجاهەدەت و سولووك و ڕیاضەت کێشان بووە تا هەموو مەقاماتی طەی کردووە • ئەوجا مەولانا ئیجازەی ئیرشادی داوەتێ و کردوویە بە خەلیفەی خۆی • پاش ئەوە

چووە بۆ ئەستەمووڵ و زۆر لە موسوڵمانانی ئەوێ لە بەرەکەتی بەهرەمەند بوون •

بیست و یەکەم ــ شێخ ئەحمەدی ئاگرەبۆزی‌یە • ئەم ذاتە پاش ئەوە کە تەریقەتی نەقشــبەندیی وەرگرتووە ، ماوەیەك لــە خزمەتی مەولانادا ماوەتەوە و عومری خۆی لە ســولووك‌کردن و جیهادی نەفسدا بەســەر بردووە و لە خزمەتی سەیید عوبەیدوڵڵای حەیدەریدا دەرســی عولوومی خوێندووە • لە تەکیەی خالیدییەدا ژوورێکی تایبەتیی بووە لەپاڵ ژووری سەیید عەبدولغەفووری مەشاهیدی و شێــخ موحەممەدولجەدیدا و لــە هاوڕێیەتیی ئەوان سوودی وەرگرتووە تا ئیجازەی خەلافەت و ئیرشادی دراوەتێ • لە بەغــدا ژنی هێناوە و خەریــکی ئیرشاد بووە • پــاش ئەوە چووە بۆ ولاتی ڕۆم و لە شــاری ئیزمیر دانیشتووە و ئیرشــادی طالیبانی تەریقەتی کردووە و خەڵکێکی زۆر لە فەیض و بەرەکەتی بەهرەمەند بوون• ئەم ذاتە لای مەولانا زۆر خۆشەویست بووە و بە یــەکێ لە گەورە گەورانی خەلیفەکانی ژمێرراوە •

شایانی وتنە شێخ موحەممەد ناوێــکی ئاگرەبۆزییش هەیە مەنسووبی مەولانا بووە ، نەك خەلیفەی و لە خانوویەکدا نێژراوە لە باکووری مزگەوتی حەزرەتی غەوثەوە •

## مەنسووبەکانی مەولانا

مەولانا وەك ئەو هەموو خەلیفەیەی بووە ، کۆمەڵێ مەنسووبیشی بووە کە بێ‌گومان دیارە ژمارەیان گەلێ لە ژمارەی خەلیفەکانی زیاتر بووە • وا لێرەدا ناوی هەندێ لەم مەنسووبانەیش ئەنووسین لە کورد و لــە غەیری کورد • لە سەرەتادا ئەمە ناوی هەندێ لە مەنسووبە کوردەکانی :

## ١ــ مەلا یەحیای مزووری (١) .

(١) پێم خۆش‌بوو بمتوانی‌یایە لەبارەی سەرگوزەشتەی ژیانی مەنسووبەکانی مەولاناشەوە ، چەندم بۆ هەڵسووڕێ ، بنووسم . بەڵام ئەوەم پێ‌نەکرا . لەگەڵ ئەوەشدا لەناو ئەوانەدا دوانیان کە مەلا یەحیای مزووری و مەلا شێخ عەبدولڕەحمانی ڕۆژبەیانین، لەبەرئەوەی کە حەقی مامۆستایەتی‌یان بەسەر کوردستان و خەڵکی کوردستانەوە زۆرە ، بە پێویستم زانی چەردەیەکیان لەبارەوە بخەمە سەر کاغەز .

مەلا یەحیا کوڕی خالیدی خەڵکی مزووری‌یە . وەك فەقێکانی سەردەمی خۆی ئەملا و لای کوردستان گەڕاوە بۆ خوێندن . زوربەی خوێندنی لای سەیید عاصمی حەیدەری بووە کە مامی صیبغەتوڵلا ئەفەندیی گەورەی حەیدەری بووە کە چووەتە بەغدا. لای زانای بەناوبانگ سەیید صاڵحی حەیدەریی ئامۆزای صیبغەتوڵلا ئەفەندیش ئیجازەی وەرگرتووە .

مەلا یەحیا پایەیەکی بەرزی لە زانستدا بووە و بە (شيخ الكل في الكل) بەناوبانگ بووە . شەهامەت و غیرەتێکی زۆری بووە و لە ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپەدا لە کەس نەسڵەمیوەتەوە . لە زانستی حەدیثدا واریثی شێخی بوخاری و لە فیقهی شافیعیدا جێ‌نشینی ئیبنوحەجەر بووە .
حاشیەیەکی مودەووەنی بەسەر ( توحفەی ئیبنوحەجەر )ەوە هەیە تا باسی نوێژی جەماعەت . ئەوەی موتالای بکا ئەزانێ پایەی عیلمی لە چپلەیەکدا بووە . نوسخەیەکی ئەم کتێبە لە خانەقای بیارە هەبوو مەلا حامیدی کاتبی شێخی سیراجوددین نووسیبوویەوە . من زۆر جار ئاواتی ئەوە ئەخوازم کە ئەم حاشیەی مەلا یەحیایە و ، حاشیەی یووسفی ئەصەم لەسەر توحفە کە نوسخەیەکی لای شێخ موحەممەدی خاڵ هەیە و، حاشیەی حاجی مەلا ئەحمەدی نۆدشە لەسەر کیتابی نیکاح و تەڵاقی توحفە کە لای مەلا نیظامەددینی نۆدشەیی‌یە لە نۆدشە و ، حاشیەی مەلا عەبدولعەظیمی سنەیی کە ئەویش لای مەلا صدیقی موجتەهیدی‌یە لە سنە، هەموو پێکەوە لە یەك دوو جەڵدێکدا کۆئەکرانەوە و لەچاپ‌ئەدران، چونکی حەللی گیروگرفتی توحفە هەر بەمجۆرە مەلایانە کراوە و ئەکرێت. من ئەم ئاواتەی خۆم وەك وەسیەتێك لێرەدا ئەنووسم بۆ هەرکەسێ خوا تەوفیقی بدا ئەم ئەرکە جێ‌بەجێ بکات بۆ خزمەتی شەریعەتی ئیسلام و بە زیندوو ڕاگرتنی یادی مەلایانی کوردەواری .

ئیبراهیم فەصیح حەیدەری لە ( المجد التالد )دا نووسیویە : مەولانا

مەلا یەحیای مزووری لە گەورە گەورانی ئوممەتی موحەممەدە و لە فیقهدا گەیشتووەتە پایەی تەرجیح . سەرەڕای ئەوە وەك دەریا بووە لە عولوومی عەقلی و نەقلیدا و لە حیکمەت و فەلەکیات و ڕیاضیاتدا دەستێکی باڵای بووە . زنجیرەی ئیجازەی گەلێ لە مەلایانی کوردستان ئەگەڕێتەوە سەر ئەم و هیی ئەمیش ئەچێتەوە سەر حەیدەری‌یەکان .

ئەم ذاتە پاش گەڕانەوەی مەولانا لە هیندستان و نیشتەجێ بوونەوەی لە سولەیمانی ، لەسەر پێشنیهادی زانایان و مەشایخی سولەیمانی ، بەنیازی تاقی‌کردنەوەی مەولانا هاتووە بۆ ئەم شارە و گەلێ لە فەقێکانی خۆی لەگەڵ خۆی هێناوە . کە گەیوەتە بەرەوە ڕاستەوخۆ چووە بۆ لای مەولانا و لای ئەو دابەزیوە و گەلێ پرسیاری موهیممی لە دڵی خۆیدا ئامادە کردووە بێ‌یانپرسێ لە مەولانا . پاش حەسانەوە چاوی بە مەولانا ئەکەوێ . بێ‌ئەوەی ئەم هیچ بپرسێ مەولانا وەڵامی پرسیارەکانی بە باشی بۆ ڕوون ئەکاتەوە . کۆڕی دانیشتنەکەی لای مەولانای زۆر بە دڵ ئەبێ و دڵی بەتەواوی ئەکرێتەوە و ویژدانی قەناعەت ئەکا کە مەولانا یەکێکە لە هەڵکەوتووەکانی ئوممەتی پێغەمبەر . تەریقەتی لەسەر دەستدا وەرئەگرێ و ئەچێتە ڕیزی مەنسووبەکانیەوە و نەصیحەتی مەلاکانی هاوڕێیشی ئەکا کە تەریقەتی لەسەر دەستدا وەربگرن . مەلا یەحیا پاش ئەم سەفەرە ئەبێ بە ( جانانە )ی مەولانا و مەولانایش زۆری خۆش ئەوێ. ئیبراهیم فەصیح حەیدەری لە زمانی شێخ ئیسماعیلی بەرزنجی‌یەوە ئەیگێڕێتەوە کەوا وتوویەتی لە خزمەتی مەلا یەحیای مزووریدا بووم لە حوجرەیەکدا . پێش نیوەڕۆ بوو ، مەلا یەحیا نووستبوو . دیم وا مەولانا لە حوجرەکەی خۆیەوە هەستا و هات بۆ حوجرەکەی ئێمە ، منیش لەبەری هەستامەوە و چووم بە پیریەوە و عەرزم‌کرد کەوا مەلا یەحیا نووستووە . فەرمووی خەبەری مەکەرەوە . مەولانا هاتە حوجرەکە و دەمی مەلا یەحیای بە نووستووی ماچ‌کرد و فەرمووی ( متعنا الله بحیاتك ) و لە حوجرەکە تەشریفی دەرچوو ، مەلا یەحیا هێشتا هەروا نووستبوو .

مەلا یەحیا پاش تەریقەت وەرگرتنی لەسەر دەستی مەولانادا ناوبانگ و شۆرەتی گەلێ زیاتر بووە و پلەی زانستی گەلێ بەرزتر بووەتەوە . ئەم ذاتە ئەولادەکانیشی مەلا ئەحمەد و مەلا موحەممەد سەلیم و مەلا عەبدوڵڵا و مەلا موصطەفا هەموو مریدی مەولانا بوون . کوڕێکی‌تریشی بووە ناوی عەبدولڕەحمان بووە ، بە دەستی یەکێ لە یەزیدی‌یەکان

شەهید بووە . ئەگێڕنەوە کە هەواڵی کوشتنی ئەم کوڕەی ئەدەنێ ، کە زۆریش مەلا چاك بووە . هەر ئەوەندە ئەڵێ (حسبنا الله ونعم الوکیل ) .

ئیبراهیم فەصیح حەیدەری لە (المجد التالد)دا نووسیویە : کە سەیید ئەسعەد صەدرەددینی حەیدەریی باپیرم وەفاتی کرد ، مەلا یەحیا میوانی ماڵی ئێمە بوو لە بەغدا ، فەرمووی من سەیید ئەسعەد صەدرەددین ئەشۆم . هەستا و شۆردی . سەیید عوبەیدوڵلای مامم ئاوی ئەکرد بە دەستیا . پاشان نوێژی جەنازەشی لەسەر کرد لەگەڵ کۆمەڵێکی زۆر لە زانایان و صاڵحانی بەغدا . مەلا یەحیا ئەم جۆرە کارانەی بە واجبی خۆی ئەزانی و ئەیوت ڕشتەی حەیدەریەکان حەقی زۆریان لەسەرمە و پێویستە خزمەتیان بکەم .

هەروەها ئیبراهیم فەصیح ئەڵێ : لەکاتێکا کە من فەقێ بووم مەولانا یەحیا لە بەغدا بوو ، صەحیحی بوخاری و شەرحی نوخبە لە ئوصوولی حەدیثدا کە ئیبنو حەجەری عەسقەلانی دایناوە و ( الاشباه والنظائر )ی جەلالەددینی سیووطیم لە خزمەتیدا خوێند . ئەویش ئیجازەی حەدیث و تەفسیر و عیلمەکانیتری پێدام و فەرمووی ئەوە ئەمانەتی خۆتانم دانەوە. مەبەستی لە عیلم بوو چونکە ئەو خۆی موجازی حەیدەریەکان بوو .

مەلا یەحیا صەد ساڵێك ژیاوە و لە بەغدا وەفاتی کردووە . مەلا عەبدولڕەحمانی ڕۆژبەیانی حازری جەنازەی بووە . ئیبراهیم فەصیح ئەڵێ : من و مەلا حوسەینی کوڕی مەلا جامی و سەیید موحەممەد ئەمینی کوڕی سەیید عەبدوڵلای حەیدەری و سەیید صاڵحی برای سەیید عەبدوڵلا شۆردمان . مامۆستا مەلا عەبدولڕەحمانی ڕۆژبەیانی لەگەڵ کۆمەڵێکی زۆر لە زانایان و پیاو چاکانی بەغدا نوێژی جەنازەیان لەسەر کرد و لە قەبرستانەکەی باخچەی بەردەمی مەرقەدی حەزرەتی غەوثدا ناشتمان .

منیش ئەڵێم ڕێکەوتێکی باشە کەوا شێخ مەلا هیدایەتوڵلای هەولێری خەلیفەی مەولانا خالید و حاجی شێخ عەبدولڕەحمان ئەبولوەفای کوڕی شێخ عوثمان سیراجوددین هەرسیانیان لەپاڵ یەکدا نێژراون و کەسیان لەنێواندا نییە .

پاش وەفاتی مەلا یەحیا مەلا ئەحمەدی کوڕی بووە بە جێگەداری و پاش ئەویش مەلا عەبدولهادیی کوڕی ( کوڕی مەلا ئەحمەد ) لە ئوترووش بووە بە مەلا . مەلا عەبدولهادی لە ١٣١٢ی هیجرەتدا کۆچی دوایی کردووە. مێژووی ئەم بنەماڵەیە پێویستی بە دەفتەرێکی گەورەیە . ئەگەر خوا یارمەتیم بدا شتێکی موناسبیان لەبارەوە ئەنووسم .

٢ـ مەلا موحەممەد سەلیمی کوڕی مەلا یەحیا •

٣ـ مەلا عەبدوڵلای کوڕی مەلا یەحیا •

٤ـ مەلا مصطەفای کوڕی مەلا یەحیا •

٥ـ مەلا عەبدوڵلای ئامێدی •

٦ـ ڕەسووڵی ذەکی •

٧ـ مەلا مەحموودی شەمزینی •

٨ـ شێخ موحەممەد قەسیمی سنەیی •

٩ـ شێخ مەلا طاهای حەریری •

١٠ـ مەلا ئەحمەدی عومەر گونبەدی کە لای مـەلا یەحیا ئیجازەی وەرگرتووە •

١١ـ مەلا مەحموودی عومەرگونبەدی •

١٢ـ مەلا موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلی کۆیی •

١٣ـ مەلا ئەبووبەکری کوچك مەلا ، باپیری مەلا ئەفەندیی هەولێر •

١٤ـ مەلا موحەممەدی هەولێری •

١٥ـ مەلا موصطەفای هەولێری

١٦ـ مەلا ئەسعەد ئەفەندیی جەلیی کۆیی •

١٧ـ مەلا ئەحمەدی گەلاڵی •

١٨ـ مەلا موحەممەدی مودەڕڕیس کوڕی مەلا جەلالی خورماڵی •

١٩ـ مەلا مەحموودی مودەڕڕیس کوڕی مەلا جەلال •

٢٠ـ مەلا عەبدولکەریمی کوڕی شێخ عومەری مودەڕڕیسی مزگەوتی گەورەی سولەیمانی •

٢١ـ سەیید عەلیی بەرزنجی قاضیی سولەیمانی •

٢٢ـ سەیید عەبدولقادری بەرزنجیی مودەڕڕیس •

٢٣ـ سەیید عەبدولعەزیزی بەرزنجی برای نەقیبی سولەیمانی •

٢٤ـ سەیید عەبدوڵلای بەرزنجی برازای نەقیب .

٢٥ـ سەیید ئیسماعیلی بەرزنجی برازای نەقیب .

٢٦ـ سەیید عەبدولقادری بەرزنجی .

٢٧ـ سەیید موحەممەدی بەرزنجی .

٢٨ـ سەیید عەلیی بەرزنجیی مودەڕڕیس

٢٩ـ مەلا شێخ عەبدولڕەحمانی ڕۆژبەیانی[٢] .

---

(٢) ئەم ذاتە لە مەلا گەورەکانی سەردەمی خۆی بووە. لە عەشرەتی ڕۆژبەیانی‌یە کە لە ناوچەی کەرکووك ئەژین . بە ئوسووڵی فەقێ‌یەتی لە کەرکووك و دەورو پشتی خوێندوویەتی و پاشان کە نزیك بووە ببێ بە مەلا ، چووە بۆ بەغدا بۆ خزمەتی سەیید صیبغەتوڵلا ئەفەندیی حەیدەری و لە خزمەتی ئەودا خوێندنی تەواو کردووە و ئیجازەی لا وەرگرتووە و لە مزگەوتی ( ئەحمەدی ) لە ( مەیدان ) لە قەراخی دیجلە ، بووە بە مودەڕڕیس .

مەلا عەبدولڕەحمان مەلایەکی زۆر گەورە بووە و گەلێ تەئلیفاتی بەکەڵکی هەیە وەکو حاشیەی لەسەر ڕیسالەی ( اثبات الواجب )ی جەلالوددینی صیددیقیی دەووانی و ، حاشیەی لەسەر ( حكمة العين ) و گەلێ زانای بەرز لە مەدرەسەکەیدا پێگەیشتوون وەکو زانای بەناوبانگ مەلا موحەممەدی بانەیی مامۆستای مەلا عەلیی قزڵجی و وەکو مەلا موحەممەدی خەطێ کە مودەڕڕیسی میر موحەممەدی ڕەواندز بووە کە مەشهوورە بە ( میرە کۆرە ) . ئەم مەلا موحەممەدە مامۆستای حاجی مەلا ئەحمەدی نۆدشەیی و مەلا عومەری خەیلانی بووە کە مودەڕڕیس بووە لە ڕەواندز . ئەم مەلا عومەرەیش مامۆستای حاجی عومەر ئەفەندیی هەولێریی باوکی مەلا ئەبووبەکر ئەفەندیی هەولێر بووە کە مەشهوورە بە ( مەلا گچکە ) .

لەسەر نووسینی ئیبراهیم فەصیح ، ئەم مەلا شێخ عەبدولڕەحمانی ڕۆژبەیانی‌یە مامۆستای تەکیەی خالیدی‌یەیش بووە . وادیارە ئەمە پێش ئەوە بووە کە ببێ بە مودەڕڕیسی مزگەوتی ئەحمەدی. مەلا عەبدولڕەحمان لە ١٢٧٠دا وەفاتی کردووە و دوو کوڕی لەپاش بەجێ‌ماوە مەلا موحەممەد و مەلا ئەحمەد. مەلا ئەحمەدیان بووە بە مودەڕڕیسی مزگەوتی ئەحمەدی لە جێی باوکیدا .

٣٠ــ مەلا ئەحمەدی ڕۆژبەیانیی کوڕی مەلا شێخ عەبدولڕەحمان •

٣١ــ مەلا موحەممەدی ڕۆژبەیانی •

٣٢ــ سەیید عەبدوللەطیفی بەرزنجی •

٣٣ــ مەلا عەبدولقادری شێخەڵمارێنی •

٣٤ــ مەلا حوسەینی پژدەری •

٣٥ــ مەلا عومەری عەسکەری •

٣٦ــ مەلا ئووەیسی عەسکەری •

٣٧ــ سەیید ئەسعەد صەدرەددینی حەیدەری •

٣٨ــ سەیید صیبغەتوڵڵای حەیدەری •

٣٩ــ سەیید عەبدولقادر صیدقیی حەیدەری •

٤٠ــ سەیید عەبدولسەلامی حەیدەری •

٤١ــ سەیید عەبدولغەفووری حەیدەری •

---

شاعیری عێراق عەبدولباقی عومەری دوو قەسیدەی بۆ لاواندنەوەی مەلا عەبدولڕەحمانی ڕۆژبەیانی وتووە ، لەو قەسیدەیاندا کە دوا حەرفی حەرفی ( تێ )یە ئەڵێ :

**قــدْ قَضى عمرَهُ بزُهــدٍ و تقــوى**
**و صَلــوةٍ مشفوعــةٍ بصِــلاتِ**
**بِبَنــانِ البَيــانِ في البحثِ كم قــد**
**حــلَّ للطــالبينَ مــن مُشكِـلاتِ**
**و بقُطــرِ العــراقِ مِحْوَرُ فَضلٍ**
**مثلُـــهُ لا أتـــى و لا هـــو آتٍ**
**بعــدَهُ اضحَــت المــدارسُ حــتى**
**مــن حلى كلِّ فــاضلٍ عــاطلاتِ**
**رجعــتْ مُطمئنَّــةً منــه نفــسٌ**
**وتســامَتْ لأرفَــعِ الدّرجـــاتِ**
**و ترقّــى ســلَّمَ العــلمِ ارِّخْ**
**شــأنُ عبــدِ الرحمــنِ للجنـــاتِ**

( ١٢٧٠ )

٤٢ـ سەیید عەبدولڕەززاقی حەیدەری •

٤٣ـ سەیید عیسای حەیدەری •

٤٤ـ سەیید فەضلو ڵڵای حەیدەری •

٤٥ـ سەیید عەبدولحەکیمی حەیدەری •

٤٦ـ سەیید عەبدولحەلیمی حەیدەری •

٤٧ـ سەیید موحەممەدی حەیدەری •

٤٨ـ سەیید ئیبراهیم فەصیحی حەیدەری ، کە خۆی نووسیویە منداڵ بووم بە خزمەتی مەولانا گەیشتم و خۆم بە خاکسار و مەنسووب ئەزانم •

لە مەنسووبەکانیشی لە غەیری کورد ناوی ئەمانەمان ئاگا لێیە :

١ـ شێخ عوثمانی کوڕی سەنەدی نەجدی •

٢ـ سەیید ئەحمەدی دیملانی •

٣ـ سەیید مەحموودی دیملانی •

٤ـ سەیید موحەممەد ئەمینی مودەڕڕیس لە بەغدا •

٥ـ سەیید موحەممەد ئەمینی سووەیدی موفتیی حیللە •

٦ـ سەیید موحەممەد ئەسعەد موفتیی حیللە •

٧ـ سەیید موحەممەد سەعید موفتیی حیللە •

٨ـ سەیید شێخ موحەممەدی طەبەقچەلی •

٩ـ سەیید ئەبووبەکری هەوواری •

١٠ـ سەیید عەبدوڵڵای داغستانی

١١ـ سەیید مەحموود شەهابوددینی ئالووسـی ، خاوەنی تەفسیری (روح المعانی) •

١٢ـ سەیید موحەممەدی کوڕی سولەیمانی بەغدادی •

١٣ـ سەیید موحەممەدی کوڕی حوسەین نەظیف •

١٤ـ سەیید سولەیمانی کوڕی سەیید جورجیس •

١٥ـ سەیید موحەممەد ئەمینی ئیبنو عابیدینی دیمەشــقی ، خاوەنی کتێبی ( ابن عابدین ) لە شەرعی حەنەفیدا •

١٦ـ عومەر ئەفەندیی غەززی موفتیی شافیعیەکانی شام •

١٧ـ شێخ عەبدولڕەحمانی کەزبەری حەدیثزانی شام •

١٨ـ شێخ عەبدولڕەحمانی طیبی •

١٩ـ عەبدوڵڵا پاشای حاکمی عەککا •

٢٠ـ داوود پاشای والیی بەغدا •

٢١ـ مەککی زادە موصــطەفا عاصــم ئەفەندی شێخولئیســلامی ئەستەموول •

٢٢ـ شێخ شامیلی داغستانی •

٢٣ـ شێخ فەوزیی سەیید ڕاغیب ئەفەندی •

٢٤ـ نەجیب پاشای والیی شام •

٢٥ـ عەینی ئەفەندی •

٢٦ـ سەیید عەبدولعەزیز ئەفەندیی گەیلانی نەقیبی ئەشرافی بەغدا •

٢٧ـ حاجی وەلییوددین پاشای والیی شام •

٢٨ـ سەیید عەبدولڕەززاقی حەیدەری •

٢٩ـ سەیید موحەممەد طاهیر ئەفەندیی حوسەینی موفتیی قودس •

٣٠ـ شێخ ئەبولخەیری دیاربەکری •

٣١ـ سەیید موحەممەد ئەسعەد ئەفەندیی کە بە (ابن النائب) بەناوبانگ بووە •

٣٢ـ شێخ صــەلاحی عەجلوونی کە بە ( ابن ابی الفتح ) بەناوبانگ بــووە •

٣٣ـ موحەممەد ئەفەندیی جونــدی موفتیی مەعەڕڕەتولنوعمان لــە حەڵەب •

٣٤ـ شێخ عومەری موجتەهیدی دیمەشقی •

٣٥ـ سەیید خەلیلی سەمین نەقیبی ئەشرافی تەرابلوسی شام •

٣٦ـ سەیید حەســەن ئەفەندیی تەقی‌یوددینی حوسەینی . موفتی و نەقیبی ئەشرافی دیمەشق •

٣٧ـ شێخ موحەممەدی ئاگرەبۆزی کە پێشتر ناومان هێنا •

## زنجیرەی طەریقەتی مەولانا

وەك زانیمان مەولانا طەریقەتی نەقشبەندیی لــە تازەکەرەوەی قەڕنی سیازدەی هیجرەت ( شاه عەبدوڵڵای دیهلەوی ) وەرگرتووە کــە لەقەبی (غولام عەلی ) بووە ، ئەویش لە (شێخ شەمسوددین جانی جانان حەبیبوڵڵای مەظهەر)ی وەرگرتووە . ئەویش لە ( سەیید نوور موحەممەدی بەدەوانی)ی وەرگرتووە ، ئەویش لە ( شێخ سەیفوددین )ی وەرگرتووە ، ئەویــش لە ( شێخ موحەممەد مەعصوومی موجەددیدی )ی وەرگرتووە کە مەشــهوور بووە بــە ( العروة الوثقى ) ، ئەویش لــە ( شــێخ ئەحمــەدی فارووقیی سەرهیندی )ی باوکی وەرگرتووە کە تازەکەرەوەی ســەدەی دوازدەهەم بووە ، ئەویش لە ( شێخ موحەممەد باقی )ی وەرگرتووە ، ئەویش لە (شێخ موحەممەدی خواجەگیی سەمەرقەندی )ی وەرگرتووە ، ئەویش لە (دەروێش موحەممەد )ی وەرگرتووە ، ئــەویش لە ( شــێخ موحەممەد زاهیــد )ی وەرگرتووە ، ئەویش لە ( خواجــە عوبەیدوڵڵا ئــەحرار )ی وەرگرتووە . ئەویش لە ( شێخ یەعقووبی چەرخی )ی وەرگرتووە ، ئەویش لــە ( شێخ موحەممەد موبارەك شــاهی بوخاری )ی وەرگرتووە ، ئەویش لە ( شــێخ عەلائەددینی عەططار )ی وەرگرتووە ، ئەویش لــە ( شــێخ موحەممەدی ئووەیسیی بــوخاری )ی وەرگرتووە ، ئەویــش لە ( شــاه موحەممەدی نەقشبەند )ی وەرگرتووە ، ئەویش لە (ئەمیر کولال )ی وەرگرتووە ، ئەویش

له ( شێخ بابا موحەممەدی سەمماسی )ی وەرگرتووە ، ئەویش له ( شێخ عەلیی ڕامیتەنی )ی وەرگرتووە ، ئەویش له ( شێخ موحەممەدی ئەنجیر فەفنەوی)ی وەرگرتووە، ئەویش له (شێخ عارفی ڕێوەگەری)ی وەرگرتووە، ئەویش له (شێخ عەبدولخالقی غەجدەوانی)ی وەرگرتووە ، ئەویش له (شێخ یووسفی هەمەدانی)ی وەرگرتووە ، ئەویش له (شێخ عەلیی فارمەدی )ی وەرگرتووە ، ئەویش له ( شێخ ئەبولحەسەنی خەرقانی )ی وەرگرتووە ، ئەویش له ( شێخ ئەبولیەزیدی بەسطامی )ی وەرگرتووە ، ئەویش له (ئیمام جەعفەری صادق )ی وەرگرتووە . ئەویش له ( قاسمی کوڕی موحەممەدی کوڕی حەزرەتی ئەبووبەکری صدديق )ی وەرگرتووە که یەکێکه له حەوت شەریعەت زانەکه ( الفقهاء السبعة ) ، ئەویش له حەزرەتی (سەلمانی فارسی)ی وەرگرتووە که یەکێکه لـه تابیعین ، ئەویش لـه ( حەزرەتی ئەبووبەکری صیددیق )ی وەرگرتووە ، ئەویش له ( حەزرەتی موحەممەدولموصطەفا )ی وەرگرتووە ، ئەویش لـه ئەمینداری وەحی ( حەزرەتی جوبرەئیـل )ی وەرگرتووە ، ئەویش له خوداوەندی گەورەو بێهەمتای وەرگرتووە .

ئەمە زنجیرەی طەریقەتی نەقشـبەندیی مەولانا . زنجیرەی طەریقەتی قادرییشی بەمجۆرەیە :

مەولانا طەریقەتی قـادرییشی هەر له ( شـاه عەبدوڵڵای دیهلەوی ) وەرگرتووە ، ئەویش لـه ( شێخ شـەمسوددین جانی جانان حەبیبوڵڵای مەظهەر )ی وەرگرتووە ، ئەویش له ( شێخ موحەممەد عابید )ی وەرگرتووە، ئەویش له ( شیخ موحەممەد سەعیدی خازین )ی وەرگرتووە ، ئەویش لـه ( شێخ ئەحمەدی فاروقیی سەرهیندی )ی وەرگرتووە ، ئەویش له ( شاه ئەسکەندەری کەتیلی )ی وەرگرتووە ، ئەویش له ( شاه کەمالی کەتیلی )ی وەرگرتووە ، ئەویش له (شاه فەضیل )ی وەرگرتووە ، ئەویش له (سەیید گەدایی )ی وەرگرتووە ، ئەویش له ( سەیید شەمسوددین )ی وەرگرتووە ،

ئەویش لە (سەیید عەقیل)ی وەرگرتووە ، ئەویش لە (سەیید بەهائوددین)ی وەرگرتووە ، ئەویش لە ( سەیید عەبدولوەهھاب )ی وەرگرتووە ، ئەویش لە ( سەیید شەرەفوددینی قەتتـــال )ی وەرگرتووە ، ئەویش لە ( ســـەیید عەبدولڕەززاق )ی وەرگرتووە ، ئەویش لە ( حەزرەتی شێخ عەبدولقادری گەیلانی)ی وەرگرتووە ، ئەویش لە (ئەبولحەسەن عەلیی کوڕی موحەممەدی قورەیشیی هەکاری)ی وەرگرتووە، ئەویش لە (ئەبولفەرەجی طەرسووسی)ی وەرگرتووە ، ئەویش لە ( عەبدولڕەحمانی تمیمی )ی وەرگرتووە ، ئەویش لە ( جونەیدی بەغدایی )ی وەرگرتووە ، ئەویش لە ( سەریی سەقەطی )ی وەرگرتووە ، ئەویش لە ( شێخ مەعرووفی کەرخی )ی وەرگرتووە ، ئەویش لە ( ئیمام عەلی ڕەضا )ی وەرگرتووە ، ئەویش لە ( ئیمام مووسای کاظم)ی وەرگرتووە ، ئەویش لە (ئیمام جەعفەری صادق )ی وەرگرتووە ، ئەویش لە ( ئیمام موحەممەدی بـــاقر )ی وەرگرتووە ، ئەویش لـــە ( ئیمام عەلی زەینولعابیدین )ی باوکی وەرگرتووە ، ئەویش لە ( حەزرەتی حوسەین )ی باوکی وەرگرتووە ، ئەویش لـــە ( حەزرەتی عەلی )ی باوکی وەرگرتووە ، ئەویش لە ( حەزرەتی پێغەمبەر )ی وەرگرتووە درووودی خـــوای لێ بی ، ئەویش لە ( حەزرەتی جوبرەئیل )ی وەرگرتووە ، ئەویش لە خوداوەنـــدی گەورەو بێهاوتای وەرگرتووە •

مەولانا هەروەها تەریقی (سوهرەوەردی)و (کوبرەوی)و (چەشتی)یشی وەرگرتووە •



# تەریقەت چی‌یە و بۆچی پێویستە ؟

تەریقەت لە عورفی ئەهلی تەصەووفدا بەمەعنای سولووك و گرتنەبەری ڕێگای بەجێ‌هێنانی عیبادەت و فەرمانبەرداریی خوای تەعالایە بە دڵسۆزی و بە ڕاستی •

خوای تەعالا لە قورئاندا فەرموویەتی : «وما خَلَقْتُ الجنَّ والانسَ اِلاّ لیَعبُدُونِ » واتە : ئادەمیزاد و جنۆکەم بۆ هیچ دروست نەکردووە بۆئەوە نەبێ بمپەرستن و بەندەگیم بکەن • پەرستن و بەندەگی‌یش ئەبێ بە دڵسۆزانە و خاوێن و بێ‌گەرد بێ • خوا لە قورئانا فەرموویەتی : « وَ ما اُمِروا اِلاّ لیَعبُدوا اللهَ مخلِصینَ لهُ الدیّنَ » واتە : فەرمانی هیچیان نەدراوەتێ ئەوە نەبێ خواپەرستی‌یان خاوێن و بێ‌گەرد بێ • هەروەها فەرمویەتی : « اَلا لِلّهِ الدینُ الخالِصُ » واتە پەرستنی بێ‌گەرد هەر بۆ خوایە • پەرستنیش کە پێویستە خاوێن و بێ‌گەرد بێ دوو بەشە • یەکەم ئەصڵی‌یە کە ئیعتیقاد و باوەڕە بە ذاتی خوا و فریشتەکان و پێغەمبەران و ئەو کتێبانەی کە خوای تەعالا ناردوونی بۆ سەر ئەو پێغەمبەرانە و باوەڕ بە ڕۆژی قیامەت و قەزا و قەدەر واتە باوەڕ بەوە کە هەرچی لە عالەمدا ئەبێ و ئەکرێ هەمووی خوا پێی ئەزانێ و بە دروستکردنی خوایە •

بەشی دووهەمیش فەرعییاتی دینە کە وتنی کەلیمەی شەهادەتە واتە ( أشهد ان لا اله الا الله وأشهد ان محمدا رسول الله ) و ، بەجێ‌هێنانی پێنج

فەرزەی نوێژ لە هەموو شەو و ڕۆژێکدا و . ڕۆژووو گرتنی ڕەمەزان لە هەموو ساڵێکدا و ، دانی زەکاتی ماڵ بە موستەحەققان و ، حەجی ماڵی خوا لە مەککە بۆ هەرکەس کە دەسەڵات و توانای ببێ وەك لە شەرعدا باسی کراوە .

بەشی یەکەم کە ئیمان و باوەڕە بە سادەیی لە تەمێ و تەربیەی ناوماڵ و لە دەمی موسوڵمانان وەرئەگیرێ و بە شێوەی عیلمیش لە خوێندنی کتێبی ئیعتیقاد و دەرس وەرگرتن لە مامۆستایانی زاناوە وەرئەگیرێ . هەروەها بەشی فەرعیاتیش لە تەمێ و تەربیەی ناوماڵ و چاولێکەریی موسوڵمانان و لە خوێندنی دەرسی شەرع وەرئەگیرێ لای مامۆستای زانا و شارەزا .

خاوێنی و بێ گەردی لە عیبادەتدا کە بۆ ئەصلیاتیش و فەرعیاتیش پێویستە ، چەند ڕێگای هەیە . یەکەم : بەهرەیەکە خوا ئەیبەخشێ بە ئادەمزاد و هیدایەتی ئەدا کەوا بە ساغی و ڕاستی خەریکی خواپەرستی ببێ. دووهەم : بەجێهێنانی ئادابی دین وەك کردنی ئەو شتانەی خوا فەرمانی بە کردنیان داوە و ، نەکردنی ئەو شتانەی خوا فەرمانی بە نەکردنیان داوە کە ئەمەش وردە وردە ئەبێ بە هۆی ئەوە کە نەفسی ئینسانی لەسەر دابمەزرێ . سێهەم : ئەو جۆرە هەوڵ و تێکۆشانە کە پێغەمبەر ( د ) کردوویەتی و بەردەوام بوون لەسەر تاعەت و سەبر و خۆڕاگرتن لەبەر باری ئازار و زەحمەتی دوژمناندا و هەوڵدان و جیهاد لە ڕێگەی ڕاستیدا و خۆ دوور ڕاگرتن لەوانە کە غافڵ و بێهۆش و بێئاگان لە بەجێهێنانی واجباتی دین ، چونکە نەفسی ئینسان هەمیشە ئینسان بەرەو گوناه و خراپە ڕائەکێشێ و نەفس تا لە سیفاتی خراپ پاك نەکرێتەوە مەیدانی ئەوە ئەبێ کە شەیتان کنەی تیا بکا و لە ڕێی چاکە لای بدا ،بۆیەش پێغەمبەر فەرموویەتی : « إنَّ الشیطانَ لیَجْری من ابنِ آدمَ مَجریَ الدَّم » واتە : شەیتان

وەك خـوێن بـەناو لەشـی ئـادەمزاددا دێت و دەچـێ • بـەکورتی نەفسی ئینسان بێتەزکیە و خاوێن‌کردنەوە ناگا بە پایەی دڵسۆزی ، بۆیەش خوا فەرموویەتی « والذّینَ جاهدُوا فینا لنهدِینَّهم سُبلنا » واتە : ئەوانەی لە ڕێگای ئێمەدا تێکۆشاون ، ڕێگای خۆمانیان نیشان ئەدەین ، هەروەها فەرموویەتی : « قد اَفلحَ منْ زکّاها و قدْ خابَ منْ دسّاها » واتــە : ئەوکەسەی نەفســی خۆی خاوێن بکاتەوە ڕزگاری ئــەبێ و ئەوکەسەی گومڕای بکا ڕەنجی بە خەسار ئەچێ •

چوارەمیش بەهۆی هاوڕێیەتی و خۆشەویستیی ڕاســتانی مەیدانی خواپەرستی وەك پێغەمبەران و ڕێبەرانی دین • لەسەر ئەم بناغەیەیە خــوا فەرموویەتی : « یا أیّها الذینَ آمنوا اتقّوُ اللهَ وکونوا معَ الصادِقینَ » واتە : ئەی خاوەن باوەڕەکان لــە خوا بترسن و لەگەڵ ڕاســتان بن و ، پێغەمبەریش فەرموویەتی : « والّذی نَفْسی بیدِهِ لاَ یُؤمِنُ أحَدُکمُ حتّی أکوُنَ أحَبَّ الیهِ مِنْ وَلَدِهِ ووالدِهِ والناسِ اَجْمعــینَ » واتە : قەسەم بەو خوایەی گیانی من بە دەستی ئەوە ، ئیمانی کەستان تەواو نابێ تا منی لا لە منالی و لە باوکی و لە هەموو خەڵك خۆشەویست‌تر نەبێ •

جا کە هاوڕێیەتیی پیاوچاکان لەگەڵ خۆش‌ویستندا هاتەدی و ئینسان ڕێگای ئەو پیاوچاکانەی گرت ، دڵی ئەبێ بە ئاوێنەی صیفات و ڕەوشتی ئەوکەسانە و بەوجۆرە کە دڵی ئەوان نوورانی بووە ، دڵی ئەمیش نوورانی ئەبێ ، وەکو چۆن ئینسان ئەگەر لای ئاگردا دابنیشێ هەموو لەشی گەرم دائەگیرســێ یا لای ئینســـانی زوێر و پەست دابنیشــێ خەم و مەینــەت دای‌ئەگرێ و لای بۆن‌خۆشێکا دابنیشێ بۆنی خۆش ئەبێ • لەســەر ئەم ئەساسەیە پێغەمبەر فەرموویەتی : « ما صبَّ اللهُ فیِ صَدْرِی شــیْئاً اِلاّ صَبّهُ في صَدْرِ أبی‌بکر » واتە : خوا هیچی نەڕژاندووەتە سنگی منەوە کە نەیڕژاندبێتە سنگی ئەبووبەکریشەوە •

لەسەر ئەم نەریتە بوو هاوڕێکانی پێغەمبەر بە بەرەکەتی هاوڕێیەتیی پێغەمبەرەوە دڵیـــان نوورانی بوو ، تابیعــین بــە بەرەکەتی هاوڕێیەتیی هاوڕێکانی پێغەمبەرەوە دڵیان ڕووی کردە خوا و پاکی و ساغی و بێگەردی لە دڵیاندا جێگیر بوو .

لەسەر ئەوەش کە خوای تەعالا خۆی خاوەن ئیرادەیە و ( يَخْتَصُّ برحمتِهِ مَن يشاءُ ) چەندکەسێ لە یارانی پێغەمبەر لەنـــاو ئەوانیتریاندا سەرکەوتووتر بوون و لەناو کۆمەڵی یارانـــدا دەرکەوتن و کەسانیتریش سوودیان لەمان وەرگرت . بۆنموونە حەزرەتی ئەبووبەکر شێوەی یادی پەنامەکی و دامەزرانی دڵ و بەندایەتیی ساغی لە دڵدا دامەزرا . ســـەلمانی فارسییش لە حەزرەتی ئەبووبەکرەوە ئەمەی بۆ مایەوە . ئیمام قاسمی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەبووبەکریش لەوەوە . هەروەها بایەزیدی بەسطامییش لە ئیمام جەعفەری صادقەوە ئیستیفادەی نوور و بەرەکەتی کرد .

## بۆچی ناوی تەریقەت لەناو ئەصحابەو تابیعیندا نەبوو ؟

لە زەمانی حەزرەتدا نوورو بەرەکەتی هاوڕێیەتیی پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ ، ئەوەندە فراوان و عالەمگیر بوو ، حیســـابی نەئەکرا . هەروا لە زەمانی تابیعینیشدا هەرچەند ئەو شێوە پێشووە نەمابوو ، بەڵام پاشماوەی نووری بەرەکەتی زەمانی پێغەمبەر هێشـــتا گەلێ زۆر بـــوو و مەجاڵی ئەوە نەبوو کەسێ بەتایبەتی مەشهوور بێ بە مورشید و مورەببی . بەڵام لە سەدەی پاشەوەدا کەسانی نەزان و بێئاگا لە خوا و دنیاپەرست ئەوەندە زۆر بـــوون پیاوانی ڕاســـتەقینە وەك ئەستێرەی شـــەوی تاریك دیارییان ئەدا و بە یەکە یەکە ئەژمێرران ، بۆیە یەکە یەکەی ئەوکەسانەی بە هاوڕێیەتیی پیاوە بەرزەکانی وەك خولەفای ڕاشـــیدین و ئەصحابە و

تابیعین پەروەردە بووبوون کەناریان گرت و لە ئەهلی فەسـاد و خراپە و بێئاگایی دوورکەوتنەوە • ئەوانەش کە ئەیانویست بچنە سەر ڕەوشت و خووی ئەوان دەوری ئەوانیان ئەدا و لەوان خڕئەبوونەوە و لەسەر ڕەوشتی ئەوان دەستیان ئەکرد بە عیبادەت و ئایین پەروەری و زوهد و خەڵوەت و پاککردنەوەی نەفس لە ڕەذیلە و خراپـە و وەرگرتنی خووڕەوشتی پاك و بەرز کە پێی ئەوترێ غەزای گەورە ( الجهاد الأكبر ) کە غەزای نەفسـە • ئەمکەسانە ئەبوون بە پێشەنگ و پێشەوای موسوڵمانان و دیارە هەریەکێ لەمانە ڕێ و شوێنێکی تایبەتیی بۆ خۆی وەرئەگرت •

بۆنموونە ئەم ئادابەی کە ئەمڕۆ مەشهوورە بە تەریقەتی نەقشبەندی ، وەختی خۆی لە سەردەمی حەزرەتی ئەبووبەکری صـیددیقەوە خوای لێ ڕازی بێ تـا زەمانی شـێخ بایەزیدی بەسـطامی ناونراوە بـە تەریقەتی ( صیددیقی‌یە ) و ، لە سەردەمی شێخ بایەزیدی بەسطامی‌یشەوە تا سەردەمی خواجە عەبدولخالقی غەجدەوانی ناونراوە بە تەریقەتی ( طەیفووری‌یە ) و ، لە سەردەمی خواجە عەبدولخالقیشەوە تا سەردەمی سـەییدی موحەممەدی بوخارایی کە مەشـهوورە بـە ( شاهی نەقشبەند ) نـاونراوە بە تەریقـەتی ( خواجەگان ) و ، لە سەردەمی ئەویشەوە تا سەردەمی خواجە عوبەیدوڵلای ئەحرار ناونراوە بە تەریقەتی ( نەقشبەندی‌یە )[1] و ، لە سەردەمی خواجە عوبەیدوڵلای ئەحراریشـەوە تا سەردەمی سـەیید ئـەحمەدی فارووقیی سەرهیندی ناونراوە بـە تەریقەتی ( نەقشبەندی‌یەی ئەحراری‌یە ) و لـە

---

(١) لەبەرئەوە کە صوورەت و صیفەتی کەمالی حەقیقی کە پێوەندی تەواو و حوزووری دڵە بە تەوەججوهاتی پیر لە دڵی مریددا نەقشی بەستووە ، یا لەبەرئەوە کە ذیکری ناوی خودا لە دڵی مریددا دامەزراوە و نەقشی بەستووە ، یا لەبەرئەوە کە صوورەتی پیر کە ناوئەبرێ بـە صوورەتی ڕابیطە لە دڵی مریددا دامەزراوە و بەهۆی ئیستیمداد لە ڕۆحانیەتی پیرەوە پێوەندی مرید گەیشتووە بە پایە .

سەردەمی ئیمامی ڕەببانیشەوە کــە هەموو ئەولیا هاودەنگن لەوەدا کــە تازەکەرەوەی هــەزاری دووهەمی هیجرییــە ناونراوە بــە تەریقــەتی (موجەددیدی یە) و ئەم ناوە تا سەردەمی شاه مەظهەری مامۆستای شــاه عەبدوللای دیهلەوی بەردەوام بووە • لە سەردەمی ئەویشەوە بە تەریقەتی (مەظهەری یە) ناوبانگی دەرکردووە و ، لە سەردەمی مەولانایشدا مەشهوور بووە بە ( خالیدییە ) • بە هەرحاڵ ئێستا لەناو مەنسووبەکانی ئەم تەریقەتەدا ناوی ( نەقشبەندی یە ) باوە •

## بۆچی بە ئەهلی تەصەووف ئەڵێن (ئەهلی تەصەووف) ؟

بیر و ڕای جیاواز زۆرە کەوا بۆچی ( صــوفیـّە ) یا ( اهلی تصوف ) وا ناونراون• مەعقوولتری ئەو بیر و ڕایانە ئەوەیە کە هەر لە زەمانی پێغەمبەرەوە (درووودی خوای لێ بێ) بەرگی زبری خورییان لەبەرکردووە کە بە عەرەبی پێی ئەڵێن ( صوف ) و نیسبەت بۆ لای ( صوف ) ئەبێ بە ( صوفی ) و بە کۆمەڵەکەش ئەوترێ ( صوفیة ) یا ( اهلی تصوف ) • حەســەنی بەصری فەرموویەتی : « لقد ادركتُ سبعين بدريا كان لباسهم الصــوف » واتە : حەفتا کەسم لە ئەصحابەی غەزای بەدر دیوە هەموو بەرگی خورییان لەبەردا بوو • خورییشیان بۆیە لەبەرکردووە کە گوێیان بە دنیا نەداوە و خەریکی عیبادەت و طاعــەت بوون و لە ســووچی مزگەوتەکانا کۆبوونەتەوە وەك فەقیرانی ئەصحابەی موهاجیرین کە لە مەککەوە کۆچیان کردبوو بۆ مەدینە و پێیانئەوتن ( اهلی صُفـّة ) و خــوا لەبارەیانەوە فەرموویەتی : « للفقراءِ الذين أُحصِرُوا في سبيلِ الله لا يستطيعونَ ضربا في الأرضِ ، يحسبُهم الجاهلُ اغنياءَ مِنَ التعففِ ، تعرفهم بسيماهم لا يَسألونَ النّاسَ الحافاً» واتە : (خێر بکەن) بەو هەژارانەی لە ڕێی خوادا ڕێیان لێ بڕاوە ، ناتوانن بە وڵاتا بگەڕێن ( نانێ بــۆ خۆیان پەیدا بکەن ) ، نەزان لەبــەر دەس پــان

نەکردنەوەیان وائەزانێ دەوڵەمەندن ، داوای هیچ یارمەتی‌یەك لە خەڵك ناکەن •

## ئەوکەسانەی ئادەمیزاد لە هاوڕێیەتی‌یانەوە پێ‌ئەگات

ئەوکەسەی کە بۆ دۆزینەوەی ڕێگای خواپەرستیی ڕاستەقینە وەك بیلەی چاو وایە و بۆ پەروەردەکرن وەك چرای تاریکەشەو وایە،پێی‌ئەڵێن (وەلی و مورشید) و (شێخی طەریقەت) • وەلی کەسێکە بەپێی توانا خواناس بێ بە ذات و صیفات و ، لە هەر سێ پایەکەی ( تەقوا )دا کە بریتین لە پاکی لە گومڕاییی کوفر و لە چڵکی گوناهی گەورە و لە پێوەندی ناڕەوا بە (ما سوی الله) غەیری خوداوە ، گەیشتبێتە پلەیەکی بەرز و واجب و سوننەت بەپێی دەسەلآت بەجێ‌بێنێ و خۆی لە حەرام و مەکرووهـ بپارێزێ و لە ژیانا بیر لە خوا بکاتەوە و بە ناخی ئەم بیرکردنەوەدا چووبێ •

نیشانەی وەلی ئەوەیە ئینسان بە هاوڕێیەتی کردنی دڵی پڕ ئەبێ لە متمانە و خاترجەمع ئەبێ و لە سەرمای دڵساردی لە دین ڕزگاری ئەبێ و بە نەشئەی خواناسین دڵشاد ئەبێ و لە پێوەندی ڕۆچوون بە بیری نامەبەستدا ئازاد ئەبێ • زادی ڕێکی و ڕاستی و ئیستیقامەت و بەردەوامیی یادی حەق وەرئەگرێ و لەسەر پێڕەوی لێ کردنی شەریعەت پایەدار ئەبێ •

## ئادابی پێڕەوانی تەریقەتی نەقشبەندی

وەك باسمانکرد هەموو تەریقەتەکان بریتین لە ڕێگای فەرمانبەداریی خوا بە ساغی و دڵسۆزی • کەواتە خەریك‌بوون بە تەریقەتەوە لە ڕاستیدا خەریك‌بوونە بە ڕاستی بە ئادابی شەریعەتەوە •

ئادابی مرید لە تەریقەتی نەقشبەندیشدا ، وەك لـە تەریقەتەكانی‌تردا بریتی‌یە لە پێڕەوی‌كردنی كیتاب و سـونەت و ، خۆپاراستن لـە هەموو بیدعەت و گومڕاهی و گوناهباری‌یەك و ، بەردەوام‌بوون لـە بەجێ‌هێنانی فەرز و سونەت و قورئان خوێندن و صەڵەوات‌دانا لە پێغەمبەر دروودی خوای لێ بێ و ، بیركردنەوە لە خواوەند و پاراستنی دەست و دەم و پێ و چاو و گوێ و زوبان و هـەموو ئەندامانی لەش لـە هەموو جینایـەت و حەرامێك و ، پاراستنی دڵ لە ئارەزووبازی بەڵكو لە یادی غەیری خوا و ، تازەكردنەوەی دەست‌نوێژ بۆ هەموو نوێژەكان و ، پشت گوێ نەخستنی نوێژی جەماعەت و جومعە و ، خـۆ شتنی هەموو ڕۆژێـكی جومعە و ، بەجێ‌هێنانی نوێژی ئیشـراق و نوێژی چێشتەنگا و نوێژی تـەراویح و ( صلوة التسـبیح ) و نوێژی ( أوّابین ) و ، ئاوەدان‌كردنەوەی نێـوانی بەرەبەیان و خۆركەوتن و نێوانی نوێژی شـێوان و نوێژی خەوتنان بـە یادكردنەوەی خوا و فەرمان‌بەرداری لێ كردنی ، ئەمە هەمووی سەرەڕای سونەتەكانی پێش و پاش نوێژ •

هەروەها خوێندنی سوورەتی ( تەبارەك ) لە هەموو شـەوێكدا و ، بەردەوامیی دەسنوێژ و ، نووستن بە دەسنوێژەوە و ، موحاسەبەی نەفس لەسەر هەموو كردەوەیەكی ئاشكرا و پەنامەكی و ، موراقـەبەی حەق لـە خەڵوەت و جەلوەتا و ، تێكۆشان بۆ ئەوە لە هـەموو گوفتار و ڕەفتارێكا بەجێ‌هێنانی فەرمانی خوا مەبەست بێ •

لەسەر مریدیش پێویستە ، وەك لەسەر هەر موسوڵمانێكی‌تر پێویستە فێری هەموو باوەڕ و حوكمێكی شەرعی ببێ و هەموو عیبادەتێك بزانێ ، تەنانـەت ئەگەر بتوانێ فێری ئەحـكامی موعامەلاتیـش ببێ • ئـەگەر خوێندەواریش بوو ، بەپێی توانا خەریكی عولوومی دینی بێ وەك تەفسیر و حەدیث و عەقاید و شەرع و كتێبی بەسوودی‌تری دینی • بەتایبەتی لە كاتێكا

که له سورشید بڕابێ موتالآی یه‌کی له‌م چوار کتێبه بکا (احیاء علوم الدین)ی ئیمامی غه‌زالی . ( قوت القلوب )ی ئه‌بووطالیبی مه‌ککی ، ( الرسالة )ی قوشه‌یری ، ( عوارف المعارف )ی سوهره‌وه‌ردی ، بۆئه‌وه‌ی له ڕێ و شوێنی ئه‌ولیا دوور نه‌که‌وێته‌وه .

یه‌کێکی‌تر له ئه‌رکه‌کانی سه‌رشانی مرید ئه‌وه‌یه که‌وا له غه‌یری کاتی وه‌عظ و ئیرشاددا یا به‌ته‌نیا خه‌ریکی ذیکر و یادی خوا و تاعه‌ت‌کردن بێ یا له‌ناو کۆمه‌ڵی مه‌لایانی خواناسدا بێ یا له‌گه‌ڵ ئه‌هلی دڵدا ڕابوێرێ و به بێ‌ناچاری له‌گه‌ڵ که‌سانی‌وا ڕانه‌بوێرێ که ئه‌هلی غه‌فڵه‌ت و گوناهباری بن ، به‌تایبه‌تی ئه‌وانه‌ی که بیر و باوه‌ڕیان خراپه . هه‌روه‌ها ئه‌بێ له هه‌ر کردارێکی‌وا دوورکه‌وێته‌وه که بۆنی ڕیا و ناساغیی لێ بێ . قسه‌و خواردن و نووستنی ئه‌وه‌نده‌ی پێویست بێ . موجامه‌له به‌پێی پێویست بکا به خووی خۆی و ده‌ر و ناوی له‌گه‌ڵ خه‌ڵك وه‌ك یه‌ك بێ . ده‌مه‌ده‌م له‌گه‌ڵ که‌سانی نه‌فام و بێ‌عه‌قڵ نه‌کا . هه‌وڵبدا بۆئه‌وه که تێکه‌ڵی کردار و ڕه‌وشتی خراپی وه‌ك فیز و حه‌ز له‌ناوبانگ و ده‌رکه‌وتن و به‌خیلی و هیوای دوور و درێژی نارەوا نه‌بێ . خۆی به زل و خه‌ڵك به بێ‌بایه‌خ نه‌زانێ . سه‌عدیی شیرازی ئه‌ڵێ :

**مرا پیر دانای مرشد شهاب**
**دو اندرز فرمود بر روی آب**

**یکی آنکه با خویش خودبین مباش**
**دگر آنکه با غیر بدبین مباش**

واته : ڕێ‌پیشانده‌ر و پیری زانام شێخ شه‌هابی سوهره‌وه‌ردی ، کاتێ که به‌سه‌ر ئاوی ده‌جله‌وه بووین ، دوو ئامۆژگاریی کردم ، یه‌که‌م ئه‌وه که له‌گه‌ڵ خۆمدا خۆمم لا چاك نه‌بێ و دووهه‌میش ئه‌وه که له‌گه‌ڵ خه‌ڵکدا خه‌ڵکم لا خراپ نه‌بێ .

هەروا ئەبێ تا پێی بکرێ هەوڵبدا بۆ چاککردنی نێوانی موسوڵمانان و خزمەتکردنی ئەوانەی پێویستیان بە یارمەتی‌یە •

## ئادابی مرید لەگەڵ مورشیدەکەیدا

ئادابی مرید لەگەڵ مورشیدەکەیدا بریتی‌یە لە چەند شتێك • یەکەم : ئەوە کە بە دڵ و زمان حورمەتی بگرێ و قەدری بزانێ ، بەڵام بەمەرجێ لە ڕادەی ئیعتیدال دەرنەچێ و نەگاتە پلەیـەك کە پێچەوانەی شـەرع بێ ، بۆنموونە بەجۆرێ لەبەری هەڵسێتەوە بگاتە ڕادەی ڕوکووع و سوجوود ، هەروەها وانەزانێ ئـەو مورشیدەی ئاگای لە شـتی غەیبی هەیە یاخود بێخواستی خوای گەورە شتێکی پێ ئەکرێ •

دووهەم : ئەوە کە بەگوێرەی توانا مورشیدەکەی خۆی خۆش‌بوێت و تێبکۆشێ بۆ زیادبوونی خۆشەویستیی ئەو لە دڵیا • سێهەم : لە هیچ کارێکا خەیانەتی لەگەڵ نەکا • چوارەم : ڕەخنە لە کردار و کردەوەکانی شێخەکەی نەگرێ و ، ئەگەر شێخ کارێکی کرد کە بەدیمەن لای ئەو ناڕەوا بوو ، مادەم بۆ ئەوە بشێ کە تەئویلی بکا ، بۆی تەئویل بکا • ئەگەر بۆئەوەش نەئەشیا کە تەئویلی بکا ، خۆی بە وەسوەسە و خەیاڵاتەوە نەهێڵێتەوە و پرسیاری ڕازی ئەو کردارە یا ئەو گوفتارەی لێ بکا بۆئەوەی ڕاستیی بۆ دەرکەوێ •

پێنجەم : هەر حاڵەتێکی لێ ڕوو بدا لە خزمەتی شێخەکەیدا بەیانی بکا • شەشەم : لە ئیشی ئیرادەت و سولووکدا بەڕاستی مرید بێ و وەختی خۆی بە فیڕۆ لەکیس نەدا • حەوتەم : شێخەکەی هەر فرمانێکی پێ سپارد بێ‌تەفرە جێبەجێی بکا ، بەڵام لە هەموو شتێکا شوێنی نەکەوێ ، بەڵکو تەنها لـەو شتانەدا کە شایانی شان و شوێن و پایەیەتی • هەشـتەم : ئەگەر کەسـێ

پرسیارێکی لە شێخەکەی کرد ، ئەم لەخۆیەوە خۆی تێ‌هەڵنەقورتێنێ و دەست‌نەکا بە وەڵام‌دانەوەی ئەوکەسە •

نۆهەم : ئاگاداریی ئەدەب بکا لە خزمەتی شێخەکەیدا • بۆنموونە لەخۆیەوە نەدوێ و قسەی زۆر نەکا و قاقا نەکا لە مەجلیسیا و کە قسەیەکی لە خزمەتیا کرد زیاد لە پێویست دەنگ بەرز نەکاتەوە و کاتی قسە کردن بزانێ • دەهەم : هەر ڕازێکی مورشیدەکەی کەوتە لای بڵاوی نەکاتەوە و قسەی شێخەکەی لای ئەوکەسانە نەگێڕێتەوە کە عەقڵیان پێ ناشکێ و لە هەموو شتێ ناگەن •

یازدەهەم : شێخی بۆئەوە بوێ کە لە دیانەتدا سوودی لێ وەربگرێ و بیکا بەهۆی ڕوون‌بوونەوەی دڵ و دەروونی و ئومێدی سوود و دەسکەوتی دنیایی نەبێ• دوازدەهەم: باوەڕ و متمانەی دڵی ببەستێ بە مورشیدەکەیەوە و وەکو خزمەتکارێکی ساغ و دڵسۆز ئامادە بێ بۆ گوێ بۆ شل‌کردنی • سیازدەهەم : لەگەڵ پێوەند و کەس‌وکاری مورشیدەکەی و بەڵکو لەگەڵ مریدەکانیشی بەئەدەب بێ •

## هۆیەکانی گەیشتن بە خوا لای نەقشبەندی‌یەکان

هۆیەکانی گەیشتن بە خوا لای نەقشبەندی‌یەکان چوارن • یەکەم : هاوڕێ‌یەتیی مورشیدی کامیل و موکەممیل لەگەڵ خۆشەویستی و ڕاگرتنی ئەدەبدا • ئەم هاوڕێ‌یەتی‌یە ئەوەیە مرید تا لە توانایدا بێ لەگەڵ مورشید بێ و لە ڕەوشت و کرداری بەرزی کەڵك وەربگرێ و ئەدەبی ئەو بکا بە سەرمەشق بۆ خۆی و وەك مردووی بەردەستی مردووشۆر وابێ لایدا لە ڕووی گوێ ڕایەڵی و فەرمانبەرداری‌یەوە • لەم صوورەتەدا مرید ئەبێ بە ئاوێنەی وێنە وەرگری ذاتی مورشید وەك چۆن ئەصحابەکانی پێغەمبەر

دروودی خوای لێ بێ بە بەرەکەتی هاوڕێیەتیی ئەو دڵیان نوورانی بووە و بوون بە مەظهەری عولوومی ڕەببانی بەجۆرێ کە قابیلی باس کردن نییە •

دووهەم : ڕابیطەی مورشید کە بریتییە لە بەستنەوەی دڵ بە مورشیدەوە • ئەمەیش دوو جۆرە • مەشهوورەکەیان ئەوەیە مرید لەپاش دەستنوێژ گرتن ڕوو بە قیبلە دابنیشێ و چاو بەیەکا بنێ و بە خەیاڵ وابزانێ مورشیدەکەی لە بەردەمیا ڕووبەڕووی ئەم دانیشتووە و، ڕۆحی پڕ ئەنواری حەزرەت (د) لەناو دڵی یا لەسەر سینەی مورشیدەکەی دابنێ و بڕیاری ئەوە بداکە هەمیشە نوور و بەرەکەت لەلای ذاتی خواوە دێتەخوار بۆسەر فەخری عالەم کەوا لەناو دڵی یا لەسەر سینەی مورشیدەکەیدا و لە حەزرەتیشەوە دائەپەڕێ بۆ ناودڵی مورشیدەکەی و لەوێیشەوە وەکو ئاوی پلووسك دائەپەڕێ بۆ سەر دڵی خۆی و ، دەوام بکا لەسەر ئەم جۆرە فکر و بیرکردنەوەیە تا هەست ئەکا دڵی نوورانی بووە و ، چەندی لەتوانادا بێ لەسەر ئەم پێوەندییە بەشدار بێ بەتەمای هاتنی بەرەکەت •

نامەشهوورەکەیشیان ئەوەیە کە صوورەتی مورشیدەکەی لەناو سینەی خۆیا دابنێ و ڕۆحی فەخری عالەمیش (د) لەناو دڵی مورشیدەکەیدا قەرار بدا • جا بەشێوەی پێشوو مولاحەظەی بەردەوامیی هاتنە خوارەوەی بەرەکەت بکا لەلاین حەزرەتی حەق تەعالاوە بۆ سەر ڕۆحی حەزرەت (د) و لەویشەوە بۆ ناو دڵی مورشیدەکەی و لە دڵی مورشیدەکەیشیەوە بێتە خوارەوە بۆ دڵی خۆی کە مرید و خاکساری ئەوە •

بەڵگە لەسەر ڕاستیی ئەدەبی یەکەم و دووهەم یەعنی هاوڕێیەتیی مورشید و ڕابیطەی قەلبیی مەعنەوی ئەوەیە کە خوای گەورە فەرموویەتی : « يا أيها الذينَ آمنوا اتقوا اللهَ وكونوا مع الصادِقين » واتە : موسوڵمانینە خۆتان لە فەرمانبەرداری نەکردنی خوا ڕاگرن و لەگەڵ ڕاستان بن • بوونیش

لەگەڵ ڕاستان بەشێوەی ظاهیر ئەبێ کە بریتییە لەو هاوڕێیەتی و خۆشەویستییەی باسمانکرد و ، بە شێوەی مەعنەوی‌یش ئەبێ وەکو ئەو هاوڕێیەتییەی کە بە ڕابیطەی مورشید دێتەجێ ، بەڵکو هاوڕێیەتیی مورشید بە مەعنای یەکەم بە بێ‌پێوەندی دڵ تەئثیری ڕۆحیی نییە ، بەڵام هاوڕێیەتیی مەعنەوی و پێوەندی ڕۆحی بەتەنها سوودبەخشە و ئەبێ بە هۆی پەردەلادان و دەرك پێ‌کردنی پایەی خاسانی خوا ، بەڵکو خواجە عوبەیدوڵڵای ئەحرار فەرموویەتی ئەوەی کە خوا فەرمانی پێ‌داوە هەر بریتییە لە تێکەڵیی ڕۆحی و بوون لەگەڵ مەردانی دەروون و نیاز پاك و ڕەوشت باش بە دڵ و گیان • ئەمەیش ڕابیطەیە وەك مەشهوورە •

دووهەم فەرماندانە بەو خیطابە کە لە ( تەحیات )دا لەگەڵ حەزرەتدا ئەکرێ دروودی خوای لەسەر بێ کە نوێژکەر ئەڵێ : « ألسلام عليك أيها النبي ورحمة اللهِ وبركاته » • ئەم خیطابە کە بەڵگەی دروستیی حازرکردنی ڕۆحانیەتی پێغەمبەرە (د) لەکاتی نوێژدا ، ئەبێ بە بەڵگەی ئەوە کەوا حازرکردنی ئەو ڕۆحانیەتانەیش دروستە کە سوودیان لێ وەرئەگیرێ •

هۆی سێهەمی گەیشتن بە خوا ذیکری پەنامەکی‌یە • ذکری پەنامەکی دوو جۆرە • یەکەم هێنانی ناوی جەلالەیە کە (الله)یە بە زوبانی دڵ • ئەم جۆرە ذیکرە بە ( معنعن ) لەمپەڕی ئەولیا مورشیدەکانەوە ڕۆیشتووە تا ئەگاتە حەزرەتی ئەبووبەکری صیددیق •

ئادابی ئەم ذیکرە ئەمەیە کە مرید دەسنوێژ بگرێ و بڕواتە شوێنێکی خەڵوەت و پەنامەکی‌یەوە دوو ڕکات سوننەتی دەسنوێژ بکات ، جا ڕوو بە قیبلە دابنیشێ بیست و پێنج جار ئیستیغفار بکات و بڵێ ( أستغفر الله •• استغفر الله) • بە دڵ بە ڕاستی ، داوای لێ‌بووردن و چاوپۆشی لە خوای گەورە بکا بۆ گوناهەکانی • پاش ئەمە چەند دەقیقەیەك تەصەووری مردنی

خۆی بکا و وابزانێ ئەوکاتە مردووە و پرسیاری قیامەتی لێ ئەکەن ، واتە وابزانێ لە قەبردایە و مەلائیکە پرسیاری لێ ئەکەن • پاش ئەمانە فاتیحە لەگەڵ سوورەتی ئیخلاص ( قُلْ هوَ اللهُ أحدٌ ) بخوێنێ و خێرەکەیان بەدیاری ڕەوانە بکا بۆ حەزرەتی فەخری عالەم ( دروودی خوای لەسەر بێ) و بۆ پێغەمبەرەکانیتر و ئەولیا و صالحان و بەتایبەتی زنجیرەی طەریقەتی نەقشبەندی و لەناو ئەمانەدا ناوی حەزرەتی ئەبووبەکر و غەوثی گەیلانی و مەولانا خالیدی نەقشبەندی و مورشیدەکەی خۆی بەتایبەتی دیاری بکا •

پاش ئەوە کەمێك ڕابیطەی مورشیدەکەی بکات و داوای یارمەتیی لێ بکات بۆ فوتووحی ڕۆحی خۆی ، ئەمجار چاو بنێ بەیەکدا و زوبانی لە ئاسمانەی دەمی توند بکات و لێوی بنووقێنێ و بە خەیاڵ وشەی پیرۆزی (الله) بەسەر دڵیدا بێنێ وەك بڵێی بە دڵ ئەڵێت (الله) و لەکاتی ئەم ذیکرەدا تا ئەتوانێ سەرنجی ئەوە بدات کە ڕووی هەر لە خوایە و ڕەزامەندیی ئەوی ئەوێ و ئەوی مەبەستە « أللهمّ انتَ مقصودی و رِضاكَ مطلوبی » • ئەیشبێ لەکاتی ئەم ذیکرکردنەدا هەمیشە چاوەڕوانی هاتنە خوارەوەی بەرەکەت بکا لە ذاتی خواوە بۆ ناودڵی • ئەبێ هەناسەیش نەدا تا تەنگەنەفەس ئەبێ ، ئەوجار هەناسەیەك بدا و هەمووکاتێ بەپێی توانا لەسەر ئەم ذیکرە بەردەوام بێ تا دڵی نوورانی ئەبێ و بە بێ‌ئیختیاری خۆی ، یادی خوا ئەکاتەوە •

پاش ئەوە کە دڵی کەوتە ذیکرکردن ، ئەم ذیکرە بگوێزێتەوە بۆ ناو لەطیفەی (ڕۆح) کەوا لەژێر گۆی مەمکی ڕاستیدا • کە ئەویش ذاکیر بوو بیگوێزێتەوە بۆ ذیکری (خەفی) کە لە لای ڕاستی سینەوەیە، جا بیگوێزێتەوە بۆ ذیکری لەطیفەی (ئەخفا) کە وا لە ناوەڕاستی سینەدا ، جا بیگوێزێتەوە بۆ ذیکری لەطیفەی (نەفس) کە وا لە دەماغدا • کە ئەو لەطیفەیەش کەوتە ذیکرکردن ئەمجارە پایەی (سلطان الاذکار) دێتە پێشەوە کە بریتییە لەوە

هەرچی ئەندامانی لەش هەیە مونەووەر ئەبن و ئەکەونە ذیکرکردن •

ئەبێ بیشزانین کە ئەم پێنج لەطیفەی بەیانمان کردن کە لەطیفەی قەلب و ڕۆح و سیڕڕ و خەفی و ئەخفان ، لە عالەمی ئەمرن کە خوای تەعالا بە ئەمری (کُنْ فیکون) دروستی کردوون لەگەڵ لەطایفی عالەمی خەلق کە لەطیفەی نەفس و چوار ڕەگەزەکە ( العناصر الاربعة)ن • ئەم پێنج لەطیفەیە ماددین و مادەم لەطیفەی نەفس نوورانی بوو ، ئەم لەطایفی چوار ڕەگەزیشە نوورانی ئەبن •

جۆری دووهەمی ذیکری پەنامەکی ذیکری ( نەفی و ئیثبات )ە بە کەلیمەی ( لا اله الا الله )• ئەم ذیکرەیش هەروەك ذیکری یەکەم ئەولیا بە ( معنعن ) ڕیوایەتیان کردووە تا ئەگاتە حەزرەتی ئەبووبەکری صیددیق خوای لێ ڕازی بێ •

ئادابی ئەم ذیکرەیش ئەوەیە کە شەخصی ذیکرکەر دەستنوێژ بگرێت و دوو ڕکات نوێژی سونەتی دەستنوێژ بکات ، جا ڕووە و قیبلە دابنیشێ و زوبانی بلکێنێ بە ئاسمانەی دەمیەوە و دانی بە دانیەوە و لێوی بە لێویەوە و هەناسە هەڵبکێشێ لەژێر ناوکەوە لەگەڵ خەیاڵی لەفظی (لا) تا ئەگاتە ئاخری دەماغ و لە دەماغەوە لەفظی ( اله ) ڕاکێشێ تا سەرشانی ڕاست و لە سەرشانەوە لەفظی ( الا الله ) بەدڵیا بهێنێ و لەگەڵ ئەم مولاحەظانەدا هەمیشە پێویستە یەکیەتیی ذاتی خوا لە دڵیدا ڕابگرێ • جارجاریش لە ماوەی ئەم ذیکرەدا بە دڵ بڵێ : « أللهمَّ أنتَ مقصودی و رضاكَ مطلوبی » • پێویستیشە لەگەڵ ئەم ذیکرەدا چاوەڕوانی هاتنە خوارەوەی ڕەحمەت و بەرەکەت بێ لە ذاتی خواوە •

هۆی چوارەمی بە خوا گەیشتن ( تەوەججوهـ ) و ( موراقەبە )یە • تەوەججوهـ و موراقەبە بریتییە لەوە کە مرید هەمیشە مەعنای ئیسمی ذات

له دڵیدا ڕابگرێ و به هیچ جۆرێ له خوا بێئاگا نەبێ • جا که حاڵی گەیشتە ئەم پلەیە سەرەتای (فەنا)ی بۆ پەیدا ئەبێ •

ئەم ئادابانەی بەیانمان کردن ، ئەبێ هەموویان لەژێر سێبەری مورشیدی تەواو و تەواوکەردا جێبەجێ بکرێن • بە قەطعی مەیدانی ئەوە نەدراوە ئادەمیزاد لەخۆیەوە بە بێمورشید دەستبکا بە موراقەبە و ذیکر و ئادابەکانیتری طەریقەت •

بەڵگەی شەرعی بۆ ئەم ذیکری پەنامەکیە لە قورئاندا زۆرە وەکو ئایەتی « واذكُرْ رَبَّكَ في نفسِك » واتە : لە دڵی خۆتا یادی خوا بکە و ناوی بهێنە ، یا « ادْعوا ربّكم تَضَرُّعاً و خيفَةً » واتە : بۆ پاڕانەوە و لەترسانا بانگکەنە خواوەند ، هەروا وەك حەدیثی قودسی کە ئەفەرموێت : «أنا عندَ حُسنِ ظنِّ عبدي بي و أنا معه اذا ذكرني ، فان ذكَرني في نفسهِ ذكَرْتُه في نفسي ، و ان ذكَرني في مَلأٍ ذكرتُه في ملأٍ خيرٍ منهُ » واتە من بەگوێرەی گومانی چاکی بەندەمم بە خۆم • من لەگەڵیمی ئەگەر یادم بکاتەوە • ئەگەر لە دڵی خۆیدا یادم بکاتەوە ، منیش لە دڵی خۆمدا یادی ئەکەمەوە • ئەگەر لەناو کۆمەڵێکیشدا یادم بکاتەوە ، لە کۆمەڵێکی چاکتردا یادی ئەکەمەوە • هەروەها وەك فەرموودەی پێغەمبەر کە فەرموویەتی : « خيرُ الذكرِ الخفيّ و خير الرزقِ ما يكفي » واتە : چاکترین یادی خوا یادیەتی بە نهێنی • چاکترین ڕۆزیش ئەو ڕۆزیەیە ئەوەندەی پێویستی ئادەمزاد بێ • ڕاستەکەشی مەبەست لە ناوبردنی خوا بە زمان ڕوونکردنەوەی دڵە ، کەواتە ناوبردنی خوا بە دڵ جێگەی ئیعتیبارە •

ئیمامی نەوەوی لە ( ألأذكار )دا فەرموویەتی : ذیکر بە دڵ و بە زوبان ئەبێ • باشتریش ئەوەیە بە هەردوکیان بێ پێکەوە • ئەگەر هەر لەسەر یەکێکیان کورتی هەڵینا ئەوە ذیکری بە دڵ خێری زۆرترە و گەورەترە •

